# ڕڤا

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک

67

# حەمەی مەلاکەریم

## درەوشانەوەیەک لە تاریکیدا

# ڕۆڤار 67

سەرپەرشتیاری گشتی
رەئوف بێگەرد

دەستەی نووسەران
یاسین عومەر
کامەران سوبحان
ئیدریس عەلی

دیزاینی بەرگ
ئارام عەلی
دەرهێنەری هونەری
ئومێد محەمەد
تایپێست
ئارام مەحمود
هەڵەچنی
سەلام مستەفا

ڕۆڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی
تایبەتە بەداهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێك دەریدەکات

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

Web Site
www.serdam.org

پەیوەندیکردن بە ڕۆڤارەوە لەرێگەی
ئیمێڵی
Rovar.rovar@yahoo.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالّح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەرویشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، جگەر خوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی،حەسەنی قزڵجی، ئیبراهیم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، ئەجمەدینی مەلا، ملا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادر، پیرەمێردی ئەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزا، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، ئەنوەر قەرەداخی.

# پێڕست

# حەمەی مەلا کەریم
# دەستێکی هەمیشە سەوز

کاکە حەمەی مەلا کەریم لەو قەڵەمە بەتواناو هۆشمەندانەیە کە زیاد لە نیو سەدەیە لەنێو پرۆسەی نووسین و کاری ڕووناکبیریی و ئەدەبیی و ڕۆژنامەنووسیی ئاشکراو نهێنیدا لە درەوشانەوە نەکەوتووە. لە بواری لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی شیعریی کلاسیکی کوردیدا لە دەستە هەرە سپی و باڵاکانە. لە بیرو بۆچوونی فیکری و نووسینی ڕەخنەگرانەدا خاوەنی دیدی ڕوناك و هەڵوێستی پێشکەوتن خوازانەی خۆیەتی. هەر لە سەرەتای ژیانیەوە بە گیانی ئازادی خوازیی و بەرگری کردن لەمافی ڕەوای چینە چەوساوەو هەژارەکانی گەلەکەیەوە نووسیویەتی و ڕووی ڕاستەقینەی داگیرکەرو کۆنەپەرستانی دەرخستووە. لەو پێناوەشدا تووشی گەلێك گرفتی ژیان و بە تەنگ هێنان و زیندانی کردن هاتووە، بەڵام هەرگیز ڕووی لە خەباتی شۆڕشگێڕانەی خۆی وەرنەگێڕاوەو لە ڕیزی نەتەوەکەی دوانەکەوتووە.
ئەم قەڵەمە باڵازرافە، چ خۆی و چ بنەماڵەکەی، بەتایبەتی هەردوو شادڕەوان "مەلا عەبدولکەریمی مودەریسی باوکی و کاك فاتیحی برای" هەمیشە ماندوونەناسانە لە سۆراخی ئەو بەیازو دەست نووسە تۆز لەسەر نیشتوانەوە بوون کە لە تاق و میحرابی مزگەوتە دوورە دەستەکان و لای خەڵکانی تەریك و پەناکەوتەدا دەستیان خستووەو لەنێو پەراوێزیی نیمچە کوژاوەو حاشیەی چەوت و چێڵدا زانیاریەکانیان ساغ کردۆتەوەو مانای تازەیان دۆزیوەتەوە. دیوانە شیعریەکانی نالی و مەحوی و مەولەویی و سالم ئەو تێزو بڕوانامانەی لەسەریان کراوە، ئەو لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونانەی تا هەنووکە لە نێوەندیی توێژینەوەو ڕەخنەی ئەدەبیی کوردیدا چاویان کردۆتەوە لەڕووە هەرە درەوشاوەکانی ڕەنج و ماندوبوونی ئەم خێزانە شکۆمەندەن. ئەمان لە دانەرانی بەردی بناغەی ئەو کارە ناوازەیەن کە مێژووی ئەدەبیی ئێمە، بەتایبەتی ئەدەبی شیعری کلاسیکیمان بە شانازییەوە دەستی وەفایان بۆ بە سنگەوە دەگرێت. ئەمە بێجگە لە چەندان ڕاوبۆچوونی تازەی کاکە حەمە لەسەر پیرەمێردو حاجی قادری کۆیی و قانع و ئەحمەدی خانی و بێخودو چەندانی تر. کاکە حەمە لە وەرگێڕانی ئەو کتێبە مێژووییە گرنگانەی کوردیان بە عەرەب ناساندووەو لایەنێکی تاریکیان لەو بوارەدا ڕوناك کردۆتەوە لە قەڵەمە بەهرەمەندەکانە، هەروەها لە وەرگێڕانی گەلێك شاکارو بەرهەمی بەنامێی تر بۆ زمانی کوردی. بە کورتی دەستی سەوزی کاکە حەمە بەردەوام بەرداربووەو بەرهەمەکانی هەمە جۆرو هەموویشیان کاریگەری خۆیان هەبووە.
ئێمەی خێزانی "ڕۆڤار" وەك هەنگاوێك بۆ ئەو پێزانینە. ئەم ژمارەیەمان بۆ کاکە حەمە تەرخان کرد. بە قەناعەتەوە دەڵێین ئەو قەرزەی لەسەرمانە زۆر لەوە گەورەو سەنگینترە کە بەکارێکی وا خاکە ڕێیانە قەرەبوو بکرێت. دەزانین کارو هەڵوێست و بەرهەمی کاکە حەمە گەلێك نووسین و توێژینەوەی بە بڕشت و قووڵیان دەوێت و خەڵکانیی زۆر شارەزاو پسپۆڕی زیاتری ئەو بوارانەی گەرەکە. بەڵام مەوداکەی ئێمەو سروشتی خودی "ڕۆڤار" تا ئێستا وا دەقیی گرتووە، هیوادارین لە ژمارەکانی داهاتوودا گوڕی تازەو ڕووی گەشاوەتر بە "ڕۆڤار" ببەخشین تا بتوانێت لە ئاستی دڵسۆزی و وەفای ئەو مرۆڤە دیارو هەڵکەوتوانەمانەوە بێت، کە لەبوارە جیاوازەکانی ژیان و ڕابردووی گەلەکەماندا، ڕوویەکی ڕووناك و ڕۆحێکی زیندووبوون.

ڕەووف بێگەرد
٢٠١١/١٢/٢٤

# محەمەدی مەلا کەریم بەقەڵەمی خۆی

* محەمەدی مەلا کەریم "کە بە عەرەبی دەنووسێ محمد الملا عبدالکریم" لە ١٩٣١/٨/١٤دا لەگوندی بیارەی سەر بە قەزای هەڵەبجەی شەهید لە پارێزگای سلێمانی لەدایکبووە

* لە قوتابخانەی منداڵە شێخەکانی بیارەدا قورئانی پیرۆزی تەواو کردووەو سەرەتای کتێبە کوردی و فارسییەکانی حوجرەی خوێندووە.

* پاشان لەسەردەستی هەندێ لە فەقێکانی بیارە دەستی کردووە بە خوێندنی سەرەتای زانستەکانی نەحوو سەرف و شەرع. هەر لای باوکی خوێندوویەتی.

* تا ساڵی ١٩٥٢ هەر لە بیارە بووەو دواتر ماڵیان هاتووەتە سلێمانی و لە ١٩٥٤ خوێندنی مەلایەتیی تەواوکردووەو شایانی ئەوەبووە کە ببێ بە مەلاو ئیجازە وەربگرێ و مێزەری سپی بە سەریەوە بپێچێ، بەڵام ئەو ئارەزووی لە مەلایەتی نەبووە.

* هەر لەوکاتەوە کە لەبیارە بووە ئارەزووی ڕۆژنامەنووسی کەوتووەتە سەری و دەستی بە نووسین بە زمانی عەرەبی لەچەند ڕۆژنامەیەکی بەغدادیدا کردووە. لەوکاتەشدا ئاشنایەتیی لەگەڵ مامۆستا گۆرانیش پەیداکردووە، دەستی داوەتە نووسینی کوردیی و لە "ژین"دا شیعرو پەخشانی بڵاو کردووەتەوەو هەندێ بابەتی فەرمانگە حوکومەتییەکانی بۆ "ژین" کردووە بە کوردی و هەڵەچنییشی تێدا کردووە.

* هەر لە بیارە گۆڤارێکی ئایینی- سیاسیی بەناوی "العروة الوثقي"وە بۆ ماوەی ساڵێك، هەر مانگی ژمارەیەك، دەرکردووەو، ئەم ناوەی لە گۆڤاری " العروه الوثقى"کەی سەیید جەمالەدینی ئەفغانی وەرگرتووە.

* هێشتا لە بیارە بووە ئاشنایەتیی لەگەڵ نووسراوەکانی سەیید جەمالەدین و شێخ موحەمەد عەبدەو موحەمەد ڕەشید ڕەزادا پەیداکردووەو چیی لێ دەست کەوتبێ خوێندوویەتیەوەو خەڵکیشی هان داوە بۆ خوێندنەوەیان.

* لە ساڵانی ١٩٤٧ و ١٩٤٨دا ئاشنایەتیی لەگەڵ ئەدەبیاتی حیزبی شیوعیدا پەیداکردووەو، لە سلێمانی چووەتە ناو هەندێ ڕێکخراوی ئەو حیزبە. لە سەرەتای ١٩٥٣ وە ئەندامێکی چالاکی لیژنەی ئاشتیخوازانی سلێمانی بووە تا گیرانی بەشی زۆری ئەندامەکانی لە پاییزی ١٩٥٤دا.

*لە ١٩٥٤/١١/١٧دا گیراوەو حوکمی بەندکرانی ساڵێك یا کەفالەت لێ سەندنی بۆ ساڵێك "خۆش ڕەفتاری" لێ وەرگیراوەو کەفالەتەکەی داوەو پاش ماوەیەك ئازاد کراوە.

* لەپاش بەربوونەکەی بە ماوەیەك کراوە بە مامۆستای وانەی عەرەبی و ئایین لە قوتابخانەی گۆیژە لە سلێمانی، بەڵام کە پاشان بۆیان دەرکەوتووە کە لەژێر کەفالەتدایە لە کارەکەی دەریان کردووەو مانگانەی مانگی دوو درهەمی وانە وتنەوەکەیان نەداوەتێ و داوای گێڕانەوەی مانگانەی مانگی یەکەمیشیان لێ کردووەتەوە، بەڵام ئەم نەیداونەتەوە.

* لە مانگی نیسانی ١٩٥٥دا گیراوەتەوە بە تۆمەتی شیوعییەتی و حوکمی دووساڵ زیندان و خستنە ژێر چاودێریی پۆلیس بۆ ساڵ و نیوێك دراوە بەسەردا، بەڵام دادگا سەرلەنوێ "استئناف"

حوكمەكەی بۆ كردووە بە ساڵێك زیندان و ساڵێك خستنە ژێر چاودێری. پارەی كەفالەتەكەی پێشووی ١٩٥٤یشیان لێ سەندووە.

* ماوەی ساڵە زیندانەكەی لە «باقووبە» و ساڵە چاودێرییەكەی لە «بەدرە» بەسەربردووە.

* لە ١٩٥٥/٧/١ دا پۆلیسی زیندانی باقووبەو پۆلیسی شاری باقووبە هێرشێكی دڕندانەیان بە بیانووی پشكنینی كەلوپەلی ناو زیندانەكەیانەوە كردووەتە سەریان و خستوویاننەتە ناو ژوورەكانیان و دەرگاكانیان لێ داخستوون و ئازارێكی زۆری گەلێكیان داون و هەرچی قەڵەم و كاغەزو كتێب و ڕادیۆ و جل و بەرگی زیادەو شتومەكیان هەبووە هەموویان بردووەو زۆریان لێ گواستوونەتەوە بۆ نوگرەسەلمان و گەلێكیان لێ خستونەتە ژووری ڕیازە كە یەكێكیان مامۆستا گۆران بووەو هەڵیانواسیووە بە بن میچەكەداو شارەزەردەواڵەیان لێ

تووشی نەخۆشی بوون. ئیتر تا شۆڕشی ١٤ی تەمووز زیندانی باقووبە هەمیشە لەژێر ئەم تەنگ پێ هەڵچنینەدا بووە.

* کە لە ١٩٥٦ دا ماوەی چاودێرییەکەی پۆلیسی تەواو دەبێ دەبرێتەوە بۆ سلێمانی. ئەوکاتەیش هێشتا هەر عومەر عەلی موتەسەڕیفی لیوای سلێمانی دەبێ، بەرەڵای ناکاو بە توهمەتی بەدرەفتاری دەیدا بە دادگای عورفی. لەو ڕۆژانەدا عومەر عەلی دەگوێزرێتەوەو دادگای عورفی هەڵدەگیرێ و داوەرییەکەی ئەم دەگوێزرێتەوە بۆ دادگای جەزاو پاش پتر لە دوو مانگ دادگای جەزای سلێمانی حوکمی زیندانی ساڵێك یا کەفالەت لێ سەندنی بۆ ساڵێك خۆشی ڕەفتاری بەسەردا دەدا. ئەویش کەفالەتەکە دەداو هەر ئەو ڕۆژە لە سلێمانی دەری دەکەن و ئەویش دەچێ بۆ ماڵی باوکی لە کەرکووك کە عومەر عەلی کاتی خۆی کە ئەم و فاتیحی برای لە زینداندابوون باوکی خۆی لە سلێمانییەوە دوور خستبووەوە بۆ گوندێکی نزیکی تازە خورماتو کە فەقێی تێدابووە دەرسیان پێ بڵێ و کە نوێژکەری تێدابووە پێشنوێژیان بۆ بکا. ئیتر باوکیشی دەچێتە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووك لای حاجی شێخ جەمیلی تاڵەبانی دادەنیشێ و حاجی شێخ جەمیلیش پێی دەڵێ: مەلا کەریم! لێرە بۆ خۆت دانیشە تا خوا پاروویەك نانی داوە پێکەوە دەیخۆین و، نەیشبوو شوکری خوا دەکەین.

لە بەدرە لەگەڵ کۆمەڵێك لە برادەرە دوورخراوەکانیدا گۆڤارێکی عەرەبی کوردییان بەناوی "کوردستان"ەوە دەرکردووە کە پاش پێزانینی لە لایەن پۆلیسی بەدرەوە ژمارەیەکیان لێ دراون بە دادگاو حوکمی زیندانی چەند مانگێکیان دراوە بەسەردا.

* ئەم ماوەی گیرانەی لە گرتووخانەی گشتی بەغداو لە رووماددی بەسەربردووەو لە سەرەتای ١٩٦٦ دا حوکمی پێنج ساڵ زیندانی و سێ ساڵ چاودێریی پۆلیسی دەدرێ بەسەردا، بەڵام تەنها سێ ساڵی لەماوەی زیندانەکەی لە زینداندا بەسەربردووە، بە فەرمانی بەڕێز مام جەلال فەرمانێکی کۆماری بۆ دەردەچێ بۆ لێبووردن لە پاشماوەی زیندانەکەی و بەوجۆرە پاش سێ ساڵ لە زیندان ڕزگاری دەبێ، بەڵام چاودێرییەکەی پۆلیس هەر بەسەرەوە دەبێ تا کوودەتای ١٧ ی تەمووزی ١٩٦٨.

* کە لەزیندان دەردەچێ لە هەردوو ڕۆژنامەی "التآخی"و

ورووژاندووەو پاشان ناردوویانە بۆ نوگرەسەلمان، ڕێگای ئەوەیان لێ گرتوون کە خۆیان نان و چێشت بۆ خۆیان دروست بکەن و ئەوانیش لەسەر ئەم بەدرەفتارییانە مانیان لە خواردن گرتووە کە بۆ ئەوانەیان لەو زیندانەدا ماون و نەگوێزراونەتەوە بۆ نوگرەو بۆ بەغداو کەرکووك بۆ داوەری کردن ٢٣ ڕۆژ و ١٢ سەعات درێژەی کێشاوە، کە خۆراکیشیان داونەتێ خۆراکی مرۆی ساغیان داونەتێ و لەوەوە زۆریان

"برایەتی"دا دادەمەزرێ و دەست بەکاردەبێ.

* لەپاش وەستانی"التأخي"و "برایەتی" لەپاش کوودەتای ١٧ی تەمووز، لە ئینحیساری تووتن دادەمەزرێ و لە گۆڤاری "التبوغ- تووتن"دا دەست بەکاردەبێ.

* پاش دەرچوونی ڕێکەوتننامەی١١ ئایاری ١٩٧٠ دەگەڕێتەوە بۆ "التأخي"و "برایی" کە کرابوو بە گۆڤارێکی مانگانە بەناوی "برایەتی"یەوە.

* لەگەڵ دامەزرانی کۆڕی زانیاریی کورددا ئینحیسار بەجێ دەهێڵێ و دەچێتە کۆڕو تا ١٩٧٨ لەوێ دەمێنێتەوە.

* پاش ئەوە کە شەهید دارا توفیق دەبێ بەسەرنووسەری "التأخي" ئیتر نووسین و دارشتن سەروتاری ڕۆژنامەکەی لەبەر ڕووناکیی ئەو هێڵە سەرەکییانە کە کاك دارا دیاریيان دەکا بۆی- بەو دەسپێرێ. لە هەمان کاتدا لە برایەتییشدا وەك بنووس کاری کردووە.

* لەپایزی ١٩٧٣دا بەغدا بەجێ دەهێڵێ و دەچێ بۆ مۆسکۆ بۆ فێربوونی زمانی ڕووسی. کە دەگەڕێتەوە، باری عێراق جۆرێکی بووەو "التأخي"و "برایەتی" دوو ڕۆژنامەی بەناوی شۆڕشی کوردەوە نەماونەتەوەو ئەمیش ئیتر کاریان تێدا ناکا بەڵام جاروبار تیایاندا هەر دەنووسێ.

* کە لەمۆسکۆ گەڕاوەتەوە چووەتەوە جێگەکەی خۆی لە کۆڕی زانیاری کورد، تا پاش هەڵوەشاندنەوەی و کردنی بەلقێکی کۆڕی زانیاری عێراق و تا ١٩٧٨ تیایدا دەمێنێتەوە.

لەگەڵ دەرچوونی گۆڤاری هەفتانەی عەرەبی و کوردیی "الفكر الجديد- بیری نوێ" لە ١٩٧٣داو تا داخرانی لە ١٩٧٨دا لەهەموو ژمارە کوردییەکانی و لەبەشێکی زۆری ژمارە عەرەبییەکاندا چالاکانە بەشداریی کردووە.

* لە مانگی هەشتی ١٩٥٧دا لە کتێبخانەی هەمووانی کەرکووك دامەزراوەو تا سەرەتای ١٩٥٩ کاری تێدا کردووە.

* لە پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووز، دەرکردنی گۆڤاری "شەفەق"ی پێ سپێرراوەو تا سەرەتای ١٩٥٩ بەرپرسی بووەو شەش ژمارەی لێ دەرکردووە.

* پاش چەند مانگێك لە بەغداوە گواستوویەتەوە بۆ کەرکووك بۆ بەشدار بوون لە دەرکردنی "ئـازادی"ی ڕۆژنامەی لقی کوردستانی حیزبی شیوعیداو پاشان لەگەڵ ڕۆژنامەکەدا گواستوویەتەوە بۆ بەغدا تا لە ١٩٦١دا داخراوە.

* پاش ئەوە بووە بە بەرپرسی گۆڤاری ئیسلاحی زەراعی بە عەرەبی و کوردی تا دەرکردنی لەوکارە کە گۆڤارەکەیش بەوە لەدەرچوون کەوتووەو پاش چەند مانگێك کوودەتای ٨ی شوبات ڕووی داوە.

* پاش کوودەتاو تا گیرانەوەی لە ١٩٦٤/٧/١٤دا بێ کار ماوەتەوە.

* لە سەرەتای ١٩٥٩وە گواستوویەتیەوە بۆ بەغداو لە ئیسلاحی زەراعـی دامـەزراوە بۆ دەرکردنی گۆڤارێکی عەرەبی و کوردی لەبارەی ڕێ بەدیییەکانی ئەو وەزارەتەوەو، گۆڤاری "هیوا"ی یانەی سەرکەوتنیشی پێ سپێرراوەو دوو ژمارەی لێ دەرکردووە.

* لە ١٩٧٨دا خۆی لەسەر سەندیکای ڕۆژنامەنووسان خانەنشین دەکاو ئیتر لە هیچ ڕۆژنامەیەکدا وەك بنووس کارناکات.

* لەپاش گواستنەوەی ڕۆژنامەی "الاتحاد"ی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان لە سلێمانییەوە بۆ بەغداو، لەپاش گواستنەوەی "التأخي"ی پارتی دیموکراتی کوردستانیشەوە لە هەولێرەوە بۆ بەغدا، هەفتەی جارێك لە هەر یەکێکیاندا وتارێکی نووسیووە. کە "الاتحاد"یش لە سلێمانی دەردەچـوو جاروبار بەناوی خوازراو وتاری بۆ دەنووسی.

* لەپێش گەڕانەوەیەوە لە بەغداوە بۆ سلێمانی لە ٢٠٠٦داو، لەپاش گەڕانەوەیەوە تا ئەم نەخۆش کەوتنەی ئێستای لە ٢٠٠٩دا هەفتەی جارێك وتارێکی لە ڕۆژنامەی "ئاسۆدا"دا بلاو دەکردەوە.

* لە ٢٠٠٦دا پاش کۆچی دوایی کردنی باوکی لە بەغداو بە خاك سپاردنی لەوێ ماڵی هاتووەتەوە بۆ سلێمانی.

* لە ٢٠٠٧ وە ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی " کۆڕی زانیاری کوردستان"ە.

* لە ٢٠٠٩/٤/١٤وە نەخۆشەو لەناو جێگادا کەوتووە.

* تا ئێستا خاوەنی زیاتر لە ٣٠ کتێب و نامیلکەیە.

* لە بەشی زۆری گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکانی عێراقدا بەرهەمی بلاو کردووەتەوە.

*وتاری نوسراوو وەرگیراوی لە چەندین گۆڤاری لوبنان و سووریەدا بلاوکردووەتەوە.

# کاکە حەمەی مەلا کەریم
# لە بەغداوە بۆ کۆیە

ڕێبوار سیوەیلی

هەتا بۆ دوورترین یادەوەری هەرزەکاری و منداڵیم بڕوانم، ناوی کاکە حەمەی مەلا کەریمم بیر دەکەوێتەوە. ناوی ئەو تەنانەت لەسەر ئەو کتێبانەش هەبوو، کە لە مزگەوتی دێی (بارێی بچووک)دا و لەسەر تاقێک، کە وێنەیەکی ئیمامی عەلی لەسەر هەڵواسرابوو. بەڵام بۆ یەکەمینجار لە ماڵی مامە غەفوور ئاغام، کە لە هەموو مامەکانی ترم خوێندەوار تر بوو، زیاتر ئەو کتێبانەم چاوپێکەوتن، کە نەک هەر ناوی کاکە حەمەیان لەسەر بوو، بەڵکو بەناوی گەورەترین مرۆڤی ڕۆحانیی سەدەی بیستەمی کورد، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مامۆستا فاتیحی کوڕی، ڕازێنرابوونەوە. هەر ماڵێک ئەو کتێبانەی لێبوونا، پڕ دەبوو لە دانایی و وشە و خودا.

یەکەم دیدارمان لە بەغدای هەشتاکان بوو. ئەمەم وەکو خەونی هەرزەکارێک لە بیرە کە بڕوای نەدەکرد حەمەی مەلا کەریم بە چاوی خۆی ببینێ و ئەوەندەش پیاوێکی ساکار و سنگفراوان بێت. من چووبووم بۆ وەرگرتنی پاداشتی وتارێکم، لەسەر ڕۆمان و گرنگییەکەی بۆ کورد، کە لە وەڵامی وتارێکی مامۆستا کەمال غەمباردا نوسیبووم. هێشتا لەوێ بووم کە هەواڵیان دامێ شیعرێکم کراوەتە عەرەبی و بڵاویش کراوەتەوە. ئەمەیان لە وەرگێڕانی کاک موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانیی بوو، یان مامۆستا عەبدولڕەزاق بیمار.. تەواو دڵنیا نیم. بەڵام چونەکەمی بۆ بەغدا کردە شایی و دڵم خۆش بوو.. وا بزانم لە ڕۆژنامەی هاوکاری بوو، یان لەو نزیکانە بە خزمەت کاکە حەمە گەیشتم. ئەویش لە پاشکۆی ڕۆژنامەی (العراق) شیعرێکی منی خوێندبۆوە و ناسیمییەوە. گرنگیی پێدام و لەگەڵ خۆی بردمی بۆ بارەگای کۆڕی زانیاری، بۆ ژوورەکەی خۆی و لەوێ شتێکی هەڵگرت کە دەبوو بینێرێ وا بزانم بۆ عەبدوڵڵاپەشێوی شاعیر. کە لە بارەگای کۆڕ هاتینە دەر، هەستمکرد دەبێت لە گەڵیدا ڕاکەم، بەدەم ڕاکردنیشەوە بۆ گەیشتن بەو پاسەی کە ئێمەی پێدەڕۆیشتین، ئاوڕیی لێدامەوە و بلیتێکی پێدام. ئاوا یەکەمین دیداری من و مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم دەستپێکرد. کە مرۆڤێک بوو زۆر لە ناوبانگی خۆی دڵگەورەتر و سنگفراوانتر و هەرواش مایەوە..

لە دوای بەجێهێشتنی کوردستان، کاتێ لە ساڵی ١٩٩١دا، بەشی یەکەمی (کتێبی نالی)م بە ناوی (چەمکی میتۆلۆژیا و جیهانبینیی نالی) لە دانیمارک بڵاوکردەوە، نازانم چۆن کاکە حەمە نوسخەیەکی بەدەست گەیشتبوو، یان هەر لە دوورەوە بۆیان باسکردبوو، بەڵام نامەیەکی شیرینی بۆ نووسیبووم و ڕەزامەندیی خۆی دەربڕیبوو لەسەر ناوەڕۆکیی کتێبەکە. پێموایە ئەو نامەیەم لە ڕێگەی مامۆستا فەرهاد شاکەلییەوە بەدەست گەیشت، کە بۆخۆیشی پیاوێک بوو زۆر پێمەوە ماندوو بوو و دەستخۆشیی لێدەکردم و لە سوید هەمیشە لە ماڵی خۆی میوانداریی دەکردم. ئەمەیان باسێکی ترەو بێگومان لە شوێنێکی تردا دەگەڕێمەوە سەری..

نامەکەی کاکە حەمە، لەوێنەی سرووشێک بوو لە سەحرادا. ئەوە هەر نامەیەکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو لە کەسێکەوە بوو لە خزمەت مامۆستای مودەڕڕیس و کاک فاتیحدا، زۆرترین بەشداریی کردبوو لە زیندووکردنەوە و ساخکردنەوە و نوێکردنەوەی ڕێنووسی دیوانی شاعیرە کلاسیکەکانی وەک نالی و مەحوی و مەولەوی و گەلێکی تر. نەوەی ئێمە لە دوو توێی ئەو تەفسیر و لێدانەوانەی ئەوانەوە ئاشنابووینەوە بە میراتی ڕۆحیی خۆمان و ئەمەش یاریدەی داین تا سەر لەنوێ لە هزری پێکهێنانەوەی شوناسیی مرۆیی و نەتەوەیی خۆماندا بین. تەنیا دانیمارک و تەنیایی پەلکێشی ناو جیهانی نالییان کردم و تەنیا ئەو نامەیەی کاکەحەمەش دڵنیای کردمەوە، کە بەو بچکۆلەییەی خۆمەوە، دەستمداوەتە کارێکی گەورە.

دوای گەڕانەوەم لە دانیمارک، سەرەتای ساڵانی دوو هەزار، کاکە حەمەم لە ئاکرێ بینییەوە و بەخزمەتی گەیشتم. ئەمەش لە گەشتێکدا بوو کە وەزارەتی ڕۆشنبیریی هەرێمی کوردستان و یەکێتی نووسەران بەهاوکاریی سەنتەری ڕۆشنبیریی ئاکرێ، ڕێکیخستبوو. لەو گەشتەدا، کە دەبوو بەشێکی بە پیادە بڕۆین، من سەرقاڵی سەرنجدان بووم لە دیمەنە جوانەکانی ئاکرێ و ئەمبەراوبەری، کە هێندەم نەزانی لە پێشمەوە، پیاوێک بە هێواشیی ڕووەو هەورازی بازاڕی سەرەوە ملی دەنا و ڕێک لەو جێیەی فرۆشیارەکان لە قەراخ شەقامەکە، بەرهەمە خۆماڵییەکانیان لەسەر سندووق و نانەشانە و قرتاڵە

دانابوون، مامۆستا کاکه حەمەم ناسییەوە. لە سنگفراوانی و ڕێز و خاکەڕاییدا، هیچ نەگۆڕابوو، بەڵام لە چاو ئەوەی لە بەغدا پێش ئەوەندە ساڵ چۆن لە پێشمەوە ڕایدەکرد تا بە پاسەکان بگات و ئەمێستاش گۆچانێك بە دەستەوە، لە جەبری زەمانە تێگەیشتم.. بۆیە پێشنیارم لە خزمەتیا کرد، کە بچین و لە چایخانەیەك دابنیشین. نازانم چەندەش لەوێ ماینەوە، بەڵام زۆرترینی کاتەکە ئەو پرسیاری لێدەکردم و من بەدەم وەڵامدانەوەوە سەرنجیم دەدا و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەمە ئەو پیاوەیە کە لە زیندان و ئازادی و لە خانەقاوە بۆ کۆڕی زانیاریی، بۆ ئێمەی نووسیوە. سەرم دەسووڕما لە توانای مرۆڤێك، کە ساڵەهابوو قەڵەم و زمانی نووسینی بۆ ڕۆشنگەری و ساخکردنەوە و ڕەخنە و توێژینەوە تەرخانکردبوو. ئەمە ئەو پیاوە بوو کە لە هۆشی منەو ماوتسی تۆنگەوە بۆ حاجی قادری کۆیی و نالی و مەحوی و چەندانی تر، کاری کردبوو. ئەمە هەر ئەو مرۆڤەش بوو کە پێشەکیی چەندین کتێب و نامیلکەی بە وشەکانی خۆی ڕازاندبۆوە و لانیکەم لەلای من، خۆشەویستیی کردبوون. پێشەکییەکەی بۆ چامەی «ناڵەی جودایی» مامۆستا هێمن و هەروەها دیوانی گۆران، بەڵگەی ئەم قسەیەن..

بۆ من، کاکە حەمە لەوەتەی هەیە شەش خەسڵەتی لە کەسایەتی خۆیدا بەرجەستە کـردووە: یەکەمیان ئەو ڕێزە زۆرەی لە کەسایەتیدا هەیەتی و بەرزگرتنی کەسانیتر و سنگفراوانییەکەی، بەڵام لە هەمان کاتیشدا مشتومڕی ئەدەبی و نووسینی لەگەڵ زۆرێك لە کەسانی هاوتەمەنی خۆیدا کـردووە، بەبێ ئەوەی سنوورەکە ببەزێنێ و هەر ئەمەش وایکردووە کە نەیارەکانیشی، ڕێزی لێبگرن..

دووەمیان، بریتیە لە کوردایەتیەکەی و قۆشمەییەکەی، کە لێرەدا وشەی قۆشمەیی لە جیاتی وشەی ئایرۆنیك (**Ironic**)، بەکار دەهێنم. کەسایەتی ئایرۆنیك، کەسایەتییەکی خۆگرە لەبەردەم ناخۆشییەکانی ژیان و دەسەڵاتی وەختدا. من لە مێژە دەزانم ئەم پیاوە کانگایەکی دەوڵەمەند و پڕی نوکتەبازی و خۆش سەلیقەییە و توانایەکی سەرسووڕهێنەری هەیە لە هەڵگێڕاندنەوەی ساتەوەختە تراژیدیەکان، بە ساتەوەختی

کۆمیدی و گاڵتەجارانە بۆ بەرگەگرتنی ناخۆشییەکانی ژیان و مانەوە لە پێناوی بەردەوامییدا. بێگومان، تێکەڵیی ئەو بە جیهانی ڕەسەنی خانەقای کـوردەواری و کۆڕی فەقێ و مەلایان، لەمەدا بێکاریگەر نەبووە.

سێیەمیان: بەردەوامیی ئەو لە نووسیندا، ئەوەش بە درێژایی ساڵەکان و لە سایەی جۆرەکانی سانسۆر و لێپێچینەوەدا. کاکە حەمە، هەمیشە وەك مامۆستایەکی نووسین و خاوەن ستایلێکی تایبەتی دارشتن و پەخشان مایەوە، کە ناسینەوەی ئاسانە و پڕە لە دەوڵەمەندیی و وشەئارایی و وردبینی جوان، کە هەندێجاریش جێگەی سەرسووڕمانە.

چوارەم: وەفاداریی بۆ باوکی: ئەو پیاوەی وەك تاکەکەس ناوێك بوو: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بەڵام لە ڕووی مەعنەوییەوە مرۆڤێك بوو سەدەی نۆزدەی کولتووری مەعنەوی کوردی بەستەوە بە سەدەی بیستەمەوە و ڕۆشنبیریی ئایینی ئەوەندە تێکەڵ کرد بە ڕۆشنبیری و شوناسیی نەتەوەیی، کە پێشتر نمونەکانی مەگەر لەلای مەلای جەزیری و نەورەسی و حاجی کاك ئەحمەدی شێخ، ببینینەوە. ئەو «درەوشانەوەیەك بوو لەناو تاریکەسەلاتدا» و مرۆڤە بوێرەکەی ناو ئەشکەوتی ئەفلاتوونیی دنیای ئێمەبوو، کە توانیی ڕۆشنایی ڕاستەقینەی کوردبوون و بڕواداریی ئایینیی بدۆزێتەوە. کاکە حەمە، لەسـەردەمی بێوەفایی بۆ بـاوك و چاخی باوككوژیی کوردەکاندا، وەك دڵسۆزێکی باوکی ڕەفتاری کرد و هەمیشە وەك کوڕە بچکۆلە و وەفادارەکەی ئەم پیاوە مایەوە.

پێنجەم: پابەندبوونی بە تێگەیشتنی «زانستیانە» لە جیهان، کە ئەم تێگەیشتنە زانستیانەیە بۆ کاکە حەمە و هاوبیران و هاوچاخەکانی، زیاتر مانایەکی چەپیانەی هەبوو، نەك زانست بە مانا پیشەیی و پسپۆڕییەکەی. کاکە حەمە لەبەرەی ئەو نەوەیەی نووسەر و ڕۆشنبیرانی ئێمەیە، کە هەمیشە وەها جیهانبینیی و ڕووئیای خۆیان دەخستە ڕوو، کە نایانەوێت بچنە بەرەی کۆنەپەرستی و ئیمپریالیزم و سەرمایەدارییەتەوە. ئەم خستنەڕووەوە، بە پێویست ئەوانی نەدەخستە ڕۆشنبیرانی چەپی دۆگمایییەوە، بەڵام بۆ ئەوان وشەی «زانستی و بەرەی زانستی و بیری زانستی»، زیاتر میتافۆرێك بوو بۆ شاردنەوە و ناونەهێنانی بەرەی چەپ و مارکسیزم و تەنانەت لینینزمیش، وەك بیرمەندانێك کە لەسەردەمی شەڕی ساردا بە سەنگەری بەرگریکردن لە هەژاران و بەرەی پرۆلیتاریا حسابیان بۆ دەکرا.

خەسڵەتی شەشەم، لە کەسایەتی کاکە حەمەدا بۆ من پرسیارێکە: ئایا ئەو نەریتخوازە یان مۆدێرنیست؟ یان تێکەڵێکە لە هەردووکیان؟ نووسینەکانی ئەم مرۆڤە پڕکارە، زۆر و جۆربەجۆرن، چ لە ڕووی بابەتەکانیانەوە و چ لە ڕووی شێواز و ژانریی ئەدەبییەوە. کاکە حەمە پڕە لە بابەتی نەریتخوازیی ڕۆشنبیریی کۆنی کورد و لە هەمان کاتیشدا هەمیشە چاوێکی لە فۆرمە ئەدەبییە مۆدێرنیستیەکان بووە. ئەو کاتێکی زۆری بەدیار کەشکۆڵ و دەستنووس و سپارەی کۆنەوە بەسەر بردووە و لە هەمان کاتیشدا وەرگێڕی پۆشکین و دنەدەری شیعری نوێی کلاسیکی کوردییە، وەك ئەوەی لە لای هێمن موکریانی دەیبینین. کاتێك (پۆشکین)ـەکەی بڵاو بۆوە، بە بڕوای من ئەمە ڕووداوێك بوو لە بواری وەرگێڕاندا بۆسەر زمانەکەمان. نوسینەکانی پڕن لە ناوی کەڵە نووسەری مۆدێرن و لە زۆرینەی بەرهەمەکانیدا ناوی چەندین نووسەر و دانا دەبینرێتەوە، کە پێشڕەو بوون لە ئەدەبیات و جیهانی مۆدێرندا، چ لە ئەوروپا و چ لە یەکێتی سۆڤیێتی جاران.. ئەمەش لەپاڵ ئەو ئاوڕدانەوە بەردەوامانەی بۆ شیعری شاعیرانی لەبیرکراوی کورد، تا ئەو پەڕی ناودارانیان.. کاکە حەمە، وەك هاوتەمەن و هاوخەمەکانی خۆی، دەیانویست بە نووسین و ڕۆشنبیری، هەم پردێك لەدەرەوە بۆ ناو دنیای ئێمە دروست بکەن و هەم لەناووەوەیش ڕۆشنبیری کوردیی بینا و نوێ بکەنەوە.

من ئیتر بە خزمەتی نەگەیشتمەوە. تا ئەو ڕۆژەی لە کۆیەی حاجی قادری نەمر، من کۆڕێکم لەسەر چەمکی کات لە شیعری حاجیدا پێشکەش کرد. پاشان چووین پەردە لەسەر پەیکەری سێوەی هونەرمەند لابدەین. هەمووجارێ کە بەوێدا تێپەڕ دەبمەوە، لەلای پەیکەرەکەی (سێوە)وە، مامۆستایەکی هەرە گەورەی بواری نووسینی کوردیشم بیر دەکەوێتەوە: حەمەی مەلا کەریم. وەك خۆی بەرێز، دڵسۆز و پڕکار و سادە و سنگفراوان..

٢٠١١

وەك لەیادم بێ خولی یەکەمی گۆڤاری (نووسەری کورد) لەپاش دامەزراندنی یەکێتیی نووسەرانی کورد دەستی پێ کردو تا پاش هەڵگیرسانەوەی شەڕی کوردستان درێژەی کێشاو لەوکاتەوە چووە چیاو لەوێش یەك ژمارەی لێ دەرچوو. من لەو ماوەیەدا هەرچەند لە کۆنگرەی یەکەمی یەکێتیدا لەسەر پێداگرتنی بەشێکی زۆری ئەندامانی کۆنگرە خۆم کاندید کرد بۆ ئەندامێتی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی، بەدووەهەمین کۆمەڵی دەنگی ئەندامان، پاش دکتۆر عیزەددین، هەڵبژێرام، بەڵام بەهۆی سەرقاڵیی بەیانیانم بەکارەوە لە کۆڕی زانیاری کوردو سەرقاڵیی ئێوارانیشمەوە لە ڕۆژنامەی (التآخی)دا، پێم نەکرا هیچ ئەرکێکی یەکێتیی نووسەران لەئەستۆ بگرم.
من هەر لەسەرەتاوە لەو لیستەیەدا کە شۆڕش کاندیدی کردبوو بۆ پێکهێنانی دەستەی بەڕێوەبەر ئەندام بووم، بەڵام وەك وتم بۆ خۆم بەهۆی کاری کۆڕی زانیاریو ڕۆژنامەی تەئاخییەوە لەو کاندیدییە وازم هێنابوو. لەکۆنگرەدا لەئەنجامی هەڵوێستێکمەوە لەپێشنیارێکی برادەرێك کە ئەو ئەندامانەی یەکێتی کە سەر بەکەرتی جەنابی مام جەلال بوون لە دوو بەشەکەی پارتیی دیموکراتی کوردستانداو کاتی خۆی دەستەی ئامادەکەری یەکێتی پێش وەرگرتنی رووخستەی دامەزراندنی یەکێتیو پێش بەستنی کۆنگرە بەئەندام وەریگرتبوون، ئەو برادەرە داوای کرد ڕێگا نەدرێ پێیان ببن بەئەندامو دەنگ بدەن، چونکە گوایە دژی شۆڕشن، منیش هەستامەوەو بەتوندی بەرپەرچی پێشنیارە پەسەندەکەیم دایەوەو گوتم ئەمانە بەپێی دەسەڵاتی دەستەی ئامادەکاری یەکێتی، ئەندامی قانونیی یەکێتینو مافی دەنگدانیان گەردی لەڕوونانیشێو ئەگەر لە فەرزێکدا شۆڕش ئارەزووی لێیان نەبێ دەتوانێ لەبنەوە ئەو ئەندامانەی کۆنگرە راسپێرێ کەسەر بەون، هەر کەس لەئەندامەکانی سەر بەکەرتی ئەولا ئەگەر هاتوو خۆی کاندید کرد بۆ ئەندامێتی دەستەی بەڕێوەبەر، ئەمان دەنگی بۆ نەدەن. ئەم وەڵامدانەوەیەی من لەلایەن ئەندامانی کۆنگرەوە پێشوازییەکی گەرمی بەچەپڵەڕێزان لێ کراو، هەربەوەیشەوە نەوەستان، هەموو داوایان لێ کردم کە دەبێ خۆم کاندید بکەم بۆ ئەندامێتی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیو منیش ناچار ملم بۆ داواکەیان کەچ کردو لەئەنجامی دەنگداندا بووم بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی، لەکاتێکدا کە ئەندامە خاوەن پێشنیاکە بەکەمترین دەنگ بوو بەئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر، بەڵام ئێمەی هەڵبژێراو، لەبەرخاتری ڕێزگرتنی زۆرمان لەشۆڕش، هەڵمانبژارد بەسەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی کورد.
لەوە پاشیش لە کۆنگرەی (دووەم)ی یەکێتیدا کە لە (١٤-١٧) ی تەمموزی ١٩٧١)دا لە هەولێر بەسترا خۆم کاندید نەکردەوە بۆ ئەندامێتی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی.
بەڵام لەو کۆنگرەیەدا کە بەعس دەستەیەکی لەسەر سپاردەکانی خۆی ڕاسپاردبوو خۆیان بکەن بەدەستەی ئـــامادەکەری کۆنگرەی (پێنج)و ئەمەیش پێچەوانەی پێڕەوی ناوخۆی یەکێتی بوو، چونکە دەستەی قانوونیی بەڕێوەبەری یەکێتی مابوو، ئەندامانی یەکێتی بڕیاریاندا بەنیازی پووچەڵ کردنەوەی پیلانی بەعسیو سەرپێ نەوی کردنی سەر سپاردەکانی چالاکان لەو کۆنگرە ناقانونییەدا بەشداری بکەنو بیکەن بەمەیدانی کێشە لەگەڵ بەعسو شکست پێدانی.
هەموومان بەکۆمەڵ چووین بۆ هەولێرو چووینە دانیشتنی یەکەمی کۆنگرەوە کە هەموو بەرپرسانی حیزبو حکوومەتی بەعس لەڕیزی پێشەوە تێیدا دانیشتبون.
بەرەی بەناو نیشتمانیو نەتەوەییی یەکگرتوویش بەسەرۆکایەتیی

بەعس لیستەیەکی ئامادەکردبوو بۆ ئەوەی ببێ بەدەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی کە ڕووە دیارەکانی یەکێتیشی وەکوو دکتۆر عیزەددین‌و چەندین کەسی تری خستبووە ناوی. من‌و دکتۆر عیزەددین‌و هەموو ڕووە نیشتمانپەروەرە ناسراوەکانی تری یەکێتی لە بەغدادو سلێمانی‌و هەولێرو دهۆك، بەیارمەتی‌و پشتیوانیی بەشی هەرە زۆری ئەندامانی یەکێتی بڕیارمان دابوو نەهێڵین پیلانەکانی بەعس بۆ دەستگرتن بەسەر یەکێتیدا سەربکەوێ.

بەداخەوە ئەم دەرفەتە تەسکەی (ئاسۆی کتێبخانە) بۆ ئەوە دەست نادا ئەوەندەی لەبیرم مابێ سەرگوزەشتەی ئەو چەند ڕۆژەی کۆنگرەتان بۆ باس بکەم. بۆیە هەر ئەوەندە دەڵێم لەو ڕۆژانەدا توانیمان خواستی سەربەرزانەی بەشی هەرە زۆری ئەندامانی یەکێتی سەرخەین‌و یەکبەیەکی پرۆژەکانی بەعس لەم بوارەدا زیندەبەچاڵ بکەین‌و لەدواڕۆژدا هەڵبژاردنێکی بەواتای وشە ئازاد بکەین، کە سەرەڕای لیستەکەی بەرەی نیشتمانی‌و نەتەوەیی زیاتر لە ٣٠کەسیش خۆیان کاندید کردو لەئەنجامدا ئێمە سەرکەوتین لەلیستەکەی ئەوان تەنها دووکەس بەئەندامی یەدەك دەرچوون کە ئەوانیش نەبەعسی بوون‌و نە لەسەرسپاردەکانی بەعس.

بەڵام پیلانی بەعس بۆ نەهێشتنی یەکێتیی نووسەران بەم شکست هێنانەیشیان نەبرایەوە. بەهەموو جۆرێ تەنگیان پێ هەڵدەچنین. ئەگەر پاش کۆنگرەی یەکەم بۆ یەکەم جارو تەنها جار دە هەزار دینار یارمەتیی یەکێتییان دابێ‌و لەسایەی سەری ڕێککەوتنامەکەی ئازارەوە جاروبار لەهەندێ شتدا بەدەنگمانەوە هاتبن، ئەم جارە ئەوەیش نەماو، دەبوو بەپارەی فرۆشتنی گۆڤارەکەمان ژمارەیەکی تری لێ دەربکەین.

بەهەرحاڵ ئێمە دەستمان کردەوە بەکار، دکتۆر عیزەددینی سەرۆکی یەکێتی بوو بەسەرنووسەری گۆڤارەکەو منیش بووم بە سکرتێری نووسینی‌و لەماوەی چوارساڵاو لەژێر تەنگەتاو کردنێکی توندوتیژدا دوانزە ژمارەمان لێ دەرکرد تا ئەو ڕۆژەی دایانخست. ئەگەر جاری یەکەم لەچیا دەرفەتی ئەوە هەبوو دوو ژمارەی لێ دەربکرێ‌و بگەیەنرێتە شارەکان‌و دەرەوە، ئەمجارە ئەویش نەبوو. شان بەشانی گۆڤارەکەی بەغدامان لقەکانی سلێمانی‌و هەولێریشمان چەند ژمارەیەکیان لە گۆڤارەکەی خۆیان دەرکرد.

ئەم کۆنگرەی پێنجەمە لەکاتێکدا بەسترا کەشەڕ لەکوردستاندا گەرم بوو، هەروەها ڕژێم لەسەر سیاسەتی زەبروزەنگی خۆی لەئاست میللەتدا زۆر توندڕەوانە دەجووڵایەوەو لەبەر ئەوە دەیویست هەموو هۆیەکانی ڕاگەیاندن بکا بە کەڕەنایەکی دەنگ ناساز بۆ پشتگیری لەخۆی، بەڵام ئێمە هەنگاوێك لەڕێگای سەربەخۆی خۆیان لامان نەداو هەر بەو جۆرە کاروباری خۆمان‌و گۆڤارەکەمان بەڕێوەبرد.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژەیەك بۆ ئەو دانیشتنەیش بکەم

که (خالید عەبد عوسمان) وەزیری کاروباری شیمال بۆ دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیو کۆمەڵێك لەسیما دیارەکانی یەکێتی سازکردو بەڕێوەبەری ئەمنی ناوچەی باکووریشی تێدابوو. ناوبراو لەو کۆنگرەیەدا هێرشی زۆر توندو بێ ئەدەبانەی بردە سەر یەکێتیو ئەندامانیو بە دوژمنی عێراقو نۆکەری ئێرانی ناوبردین، بەڵام ئێمەش ئازایانەو چاونەترسانە بەوە بەرپەرچمان دایەوەو داکۆکیمان لەخۆمانو لەهەڵوێستی یەکێتییەکەمان کرد. شایانی وتنە مامۆستا (مستەفا ساڵح کەریم بەوردەکارییەوە باسی ئەم رووداوەی لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا کردووە) ئێمەی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی لە

دانیشتنێکماندا بڕیارێکمان لەم بارەوە داو دکتۆر عیزەددینمان کرد بە بەرپرسی جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە، چونکە بیری زۆر تێرەو شتی لەبیر ناچێ، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا بۆ نەکراوە ئەم بڕیارە جێبەجێبکا. پێشتر وتم کەمن بووم بەسکرتێری نووسینی گۆڤاری نووسەری کورد، بەڵام لە تەنها دوو ژمارەی یەکەمو دووهەمیدا ناوم وەك سکرتێری نووسین لە لاپەڕەی یەکەمی گۆڤارەکە نووسرا، لەوەپاش ناوی کاك مومتاز وەك ڕۆژنامەنووس لە ڕۆژنامەی (العراق) دوورخرابووەوەو پێویستی بە عینوانێکی ڕۆژنامەنووسی بوو، بۆیە بڕیارمان دا ئەو ببێ بەسکرتێری نووسینو تا دوا ژمارەی گۆڤارەکە

ناوی بەسەریەوە بوو لەکاتێکدا کە ئەو ماڵی لە هەولێر بوو و گۆڤارەکە لە بەغدا دەردەچوو.

زۆربەی کارەکانی دەرکردنی گۆڤارەکە تا وەستانی لەئەستۆی مندا بوو، هەر لە تەماشای ئەو وتارانەوە کە بۆی دەهاتن تا هەڵبژاردنی ئەو وتارانەی تێیدا بڵاودەکرانەوە، تا هەڵەچنی کردنی پرۆڤەکانی، تا پێچانەوەی ژمارەکانیو خستنە ناو گونیەیانو بردنیان بۆ گەراجو ناردنیان بۆ سلێمانیو هەولێرو کەرکوكو دهۆكو ناردنی ئەو ژمارانەی بەدیاری دەمناردن بۆ هەندێ لایەنو هەندێ کەسو.. تاد، تەنها لەخستنە گونییەیانو بردنیان بۆ گەراج یارمەتیم لە برادەرێکی قوتابی وەردەگرت کە لە بەغدا دەیخوێند. بەعس بەهیچ جۆرێ ئەوەی بۆ قووت نەدەچوو کەوا گۆڤارێك بەکوردی لە پایتەختی عێراقدا جاروبار دەربچێو لەناو ئەو گشت گۆڤارو ڕۆژنامانەدا کە دەردەچوونو هەمیشە سەری زمانو بنی زمانیان ماستاوکردن بوو بۆ بەعسو هەڵدان بوو بەشانوباڵیداو درۆو دەلەسە بۆ ڕیزکردنی بوو، بەڵام بەهیچ جۆرێك وشەیەکی بڵاونەدەکردەوە بۆنی نزیکی لە بەعسەوە لێ بێ بۆیە بەعس بەهەموو جۆرێك هەوڵیان دەدا دەنگی ئەو گۆڤارە کپ بکەن کە نەدەچووە ژێر ڕکێفیانەوە هەرچەند هیچ بابەتێکی وایشمان نەدەتوانی تێدا بڵاوبکەینەوە کە بەئاشکرا نیشانەی نارەزایی ئەوانی پێوەبێ، بەڵام هەر ئەوەندە بەس بوو بۆ نارەزایی لێی کە هیچێکی وای بڵاونەدەکردەوە بەخوێی چێشتیش بگاتەوە بەبیروبۆچوونی ئەوان.

تا ئەوە بوو سەرەنجام قانوونێکیان دەرکرد بۆ بەناو «یەکخستنی هەموو کۆمەڵ و ڕێکخراوە ئەدەبییەکانی عێراق».

ئێمە بەهەرجۆرێ کە پێمان کرا نارەزاییی خۆمان لەوە دەردەبڕی کە یەکێتی نووسەرانی کورد لەناو ئەو ڕێکخراوەدا کە دایاننابوو و ناویان لێ نابوو «یەکێتی گشتیی ئەدیبانو نووسەرانی عێراق»دا بتوێنرێتەوە لەم بارەوە گفتوگۆی زۆرمان لەگەڵ کردنو لەئەنجامدا ڕەزامەندیمان پیشاندا کە بچینە ناو ئەو یەکێتییە بەو مەرجەی کە یەکێتیی نووسەرانی کوردیش وەك ڕێکخراوێکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی ناوخۆدا، لەناو یەکێتییە گشتییەکەدا بێو قانوونەکەی وا هەمواربکرێ کە دان بەم سەربەخۆییە ناوخۆییەی یەکێتیی نووسەرانی کورددا بنێ، بەڵام درۆیان لەگەڵ کردینو قانوونەکەیان هەموارنەکردو پاش ماوەیەك بەناو ڕێکخراوێکیان لەچەند ئەندامێکی یەکێتیی نووسەرانی کورد کە سەربەخۆیان بوون بەناوی (المکتب الثقافي الکردي) یەوە پێکەوە نا. پاشتریش ئێمە لەکۆنگرەی یەکێتیی ئەدیبانو نووسەرانی عێراقدا لەوتارێکدا کە دکتۆر عیزەددین خوێندیەوە،

ئەوەمان بە هەمووواندا ڕاگەیاند کە ئەگەر مەرجە لەسەر ڕێککەوتووە پێشووەکانمان بۆجێبەجێ نەکەن ئێمە لەم یەکێتییە عێراقییەدا نامێنینەوە.

بەکردەوەیش من لەیەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی سەنتەریی یەکێتیی نووسەران‌و ئەدیبانی عێراقدا جاڕی کشانەوەی خۆمم لەو یەکێتییەدا. لەو کاتەدا دکتۆر عیزەددین لە دەرەوەی وڵات بوو. کەهاتەوە ئەویش نەچووە ناو ئەو ئەنجوومەنە سەنتەرییەوەو بەشی هەرە زۆری ئەندامانی یەکێتیی پێشووی نووسەرانی کورد بەهیچ جۆرێك نەچوونە ناو یەکێتییە عێراقەکەوە، گۆڤارە ڕاستەقینەکەی نووسەرانی کورد وەستا، بەڵام تاقمە دەست نیشاندەکەی میری هەر بە ناوی (نووسەری کورد)ەوە چەند ژمارەیەکیان بەکوردی‌و بەجیایش بە عەرەبی لە گۆڤارەکەدەرکرد، بەڵام ئەوانیش زیادەڕۆییان لە گۆڤارەکەیاندا نەکردو نەیانکرد بەگۆڤارێکی وا کەمیری دەیویست، تاپاش سەرکەوتنە مەزنەکەی ڕاپەڕینی ۱۹۹۱ی کوردستان، ئەدیبانی کورد کۆنگرەیەکیان لەشەقڵاوە گرت‌و جاڕی دامەزراندنی یەکێتیی سەربەخۆی ئەدیبانی کوردیان دا.

ئەوەی مایەی شکۆو شانازیی هەموو ئەندامانی سەربەرزی یەکێتی نووسەرانی کورد بوو لە ۱۹۷۰وە تا هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی‌و داخستنی گۆڤارە رووسوورەکەی، ئەوەیە بەدرێژاییی ئەو ماوەیەو لەگەڵ ئەو هەموو تەوژم‌و گوشارە جۆربەجۆرانەی دەخرانە سەرمان کە چەندین ساڵیشی ڕێکەوتی جەنگی چەپەڵی عێراق‌و ئێرانی کرد، ئەوە بوو یەك وشەی پشتگیریمان لەڕژێم‌و لەو جەنگە چەپەڵەی لەلاپەڕەکانی گۆڤارەکەماندا بڵاو نەدەکردەوەو تاقە جارێك چییە ناوی قادسییەی سەددامامان تێیدا نەهێناو تا بوویشین هەر بەو هەڵوێستەوە ماینەوە، ئەمە کورتەیەکی ناتەواوی مێژووی یەکێتیی نووسەرانی کوردو هەڵسووڕانی من بوو لەکارکردندا لەم گۆڤارەدا، هیوام وایە ئێستاو دوارۆژی یەکێتیی‌و گۆڤارەکانی‌و گۆڤاری (نووسەری کورد)یش کە بەهیوام بەم نزیکانە دەربچێتەوە زۆر لە جاران جوانترو گەشتر بێ، پێشکەشی خوێندەوارانی ئازیزی (ئاسۆ کتێبخانە)و بەتایبەتی وەچە نوێی لاوانی کوردی دەکەم کە ئەم بڵاوکراوەیە دەخوێننەوە. هیوام وایە مایەی ڕەزامەندییان بێ.

«حەمەی بـرام»... دەمێکە هەر وای ناو ئەبەم، هەر ئەمە وایکردبوو کە کچەکانم کە هێشتا منداڵ بوون بانگیان دەکرد «حەمام»و ئەمە لەناو زۆر لە برادەرندا بۆی بوو بە ناو.
زۆرباش بیرمە کە ساڵی ١٩٤٨ ناسیم، من پێشتر لەگەڵ باوکمدا چووبوومە بیارە، کە باوکم لەخزمەت مامۆستادا «مامۆستا مەلا کەریم» لەباخێکدا دانیشتبوون و منیش ئەهاتم و ئەچووم، مامۆستا دەیفەرموو: بچن سەلاح بهێنن با پێکەوە یاری بکەن. دووایی کە کاکە حەمەم ناسی، تێگەیشتم کە ئەو لە من گەورەترە و ئەو دەمە لە خزمەت نەقیباندا خوێندوویەتی و ناو منداڵانی هەر نەدیووە.
ساڵی ١٩٤٨ لەسەر سەکۆکەی مزگەوتی خۆمان لەگەڵ کۆمەڵێك فەقێدا دانیشتبووین، زۆربەیان بەهۆی هاوڕێ مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانییەوە «تەمەنی درێژ بێت» سەر بە حیزبی شیوعی بوون. کاکە حەمە بەنزیکی لە ڕێبازی سەید قوتبەوە «قطب» بەرگریی لە بیری ئیسلامی دەکرد. هاوڕێ مەلا ئەحمەد لای وابوو قسە لەگەڵ کاکە حەمەدا سوودی نییە. کەچی وادەرنەچوو. کاکە حەمە زۆری دەخوێندەوە، تەنانەت لە چوونێکمدا بۆ بەغدا ڕیسپاردم کتێبەکانی سەید قوتبم بۆ هێنا. ماڵیان هاتە سلێمانی، هێشتا لە مزگەوتی حاجی حان دەیخوێند کە چووە بزووتنەوەی ئاشتیخوازانەوە. هەر لەو بزووتنەوەیەدا لەگەڵ کەسانی ناسراودا بوو بە دۆست.
ئەوان کتێبی مارکسیان دەدایـەوە، دەیخوێندەوەو کار لە ئاشتیخوازانداو ئەو کتێبانە پێکەوە بەرەو حیزبی شیوعییان هێنا. ڕەنگە بڵێم کە یەکێکە لەو کەسە دەگمەنانەی کە بیر بەرەو ئەو ڕێبازەی هێناوە. چونکە ئێمە لەسەرەتاوە لە تەمەنێکی زوودا سۆزو عاتیفەو دروشم بەرەو ئەو ڕێگەیەیان بردین، دووایی خوێندنەوەی بـەردەوام لە ڕاستی و ناوەڕۆکی ڕێبازەکەی خۆمانی هێناین. کاکە حەمە هەر بەوجۆرە لە مامۆستا گۆران نزیك بۆوەو لە «ژین»دا کەوتە نووسین. هەروا بزانم پێوەندیی بە باوکی و کاك فاتیحی برا گەورەیەوە خستییە سەر ڕێبازی ئەدەبیات و نووسینەوەی دیوانی کەڵە شاعیران.
ساڵی ١٩٥٥ لە هێرشێکی سەختدا بۆ سەر شیوعییەکان ئەویش بەرکەوت. ئـازاری زۆریـان دابـوو، بەڵام مەردانە خۆی گرتبوو. چەند ساڵی لە بەندیخانەی «نوگرە سەلمان» بە بەندی و ساڵێك زیادی لە دوورخستنەوە لەژێر چاودێریی پۆلیسدا لە «بەدرە» لەگەڵ مامۆستا گۆراندا بردەسەر. هەر لەو سەردەمەدا کەوتە نووسینەوەی شیعرەکانی گۆران. ڕەنگە بڵێم ئەو نەبووایە شیعری گۆران فەرتابوون. چونکە مامۆستا گۆران خۆی شیعری لەبەرنەبوو.
لاپەڕەی دۆستایەتی و هاوڕێیەتی من و کاکە حەمە چەند «ڕۆڤار»ی دەوێ.
پاش شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ پێکەوە لە ڕۆژنامەی «ئازادی»دا کۆبووینەوە. ڕەنگە یادگاری کارکردن لە ئازادیشدا چەند «ڕۆڤار»ی بوویت. من لە ١٩٦٠/٣/١٧دا ڕوومکردە مۆسکۆ، چەند ساڵم لەوێ و لە باکۆو لە سۆفیا بردەسەر، هاتمەوە بۆ چیای کوردستان. کاکە حەمە لە کودەتای ١٩٦٣ دا خۆی شاردبۆوە. دووایی کە من هاتمەوە، بارێکی لەبارتر بۆ ئەو ڕەخسا کە لە ڕۆژنامەی «بیری نوێ»دا کاربکا. دیسان ڕۆژی چەند سەعاتمان پێکەوە دەبردەسەر، پاشان لە ١٩٧٨دا لە یەکێتیی نووسەرانی کورد دا پێکەوە کەوتینەوە کارو ژمارەکانی «نووسەری کورد» کە من سەرنووسەری بووم و ئەویش سکرتێری نووسین و هەمەکاری بوو، دیسان چەند لاپەڕەی یادگاری دەوێ.
لەم چەند ساڵانەی دووواییدا تا باری گرانی لەشی کونجی ماڵەوەی پێ نەگرتبوو، پێکەوە چوونی «هەولێر» بۆ کاری ئەکادیمیای کوردی یادگارەکانمان دەوڵەمەندتر دەکەن.
هیوام وایە ئەم کورتەیە لێکدانەوەی ئەوە بێ بۆچی هەمیشە ناومان پێکەوە دێ.
هیوام وایە دەرفەتی چاکترم بۆ نووسین لە بارەی ئەم کەڵە تێکۆشەرە نووسەرە، لە بارەی «حەمەی برام»ەوە بۆ برەخسێ
سوپاس بۆ «ڕۆڤار».

شێرکۆ بێکەس

# کاکە حەمەی هەرمێ گوڵاویی!*

تەون

هەورامان کوڕی شاخەو
سیاچەمانە کچی باخەو
لەم دووانەیەیش نەوەی شیعرو پەخشان کەوتنەوەو
لەدارگوێزێکی نوورانیش «مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس» کەوتەو
لەویش کۆمەڵێ درەختی ڕووناکبیر
کە یەکێکیان حەمەی مەلا کەریمی هەرمێ گوڵاویی بوو!

بنەماڵەیەك لە مۆم
کاتێ مۆم نەبێ بە قەڵەم و
قەڵەمیش لەناو مۆمدانی
خۆشەویستیی زمانی کوردیدا نەتوێتەوە.
تەمەنێك لە نارەقەی شین و مۆری
زەنگۆڵ زەنگۆڵ
وەختێ نارەقە نەبێ بە وشەو
وشەیش نەبێ بە دڵۆپەی نێوان
بیرو پەنجەو بەسەر تەوێڵی
پەڕەکاغەزدا نەتکێتەوە.

تەمەنێك لە تەونی ڕستە
وەختێ ڕستە سەدان پەنجەرەی
ڕەنگاوڕەنگ، بازنەیی، لاکێش و
چوارگۆشە لەسەر ماڵانی
عاشقانی خوێندنەوە نەکاتەوە.

لە هەورامانەوە بۆ لای شارەزوورو
خەرمانی شیعری نالی و لەوێشەوە بۆ لای
سلەیمانی و نەوینی شاخی گۆیژەو شیعری
تازەی گۆران و لەوێشەوە بۆ لای دیجلەی

جەواهیری و ماسیەکانی ناو خەونی شینی
نەوێ!

«حەمەی مەلا کەریم»
پیاوێ لە دارهەرمێی وشە.
ماندوویەك لەناو توونا‌وتوونی کتێبدا.
باڵندەیەك کە هێلانەکەی
وا لە چاپخانەداو
فڕینی وا لە ئاسمانی هەر هەموو کورددداو
دان و ئاوی
حەرف و مەرەکەب و
شوێنی چینەکردنیشی
ناو دڵی هەموومان!

ئەمەنێکە ئەم درەختە ئەناسم و
ئەمەنێکە ئاوێنەکانی هاتوونەتە
سەر ڕەفەی کتێبخانەکەم و
زۆرجاریش باوەشم کردووە
بە زمانە شیرینەکەیداو
دەستەواژەکانیم ماچکردووەو
لەگەڵ شیعرمدا پێکەوە
لە سینەمدا نواندوومن!

وەختێ ئەدەب هات
من ئاگام لە هیچ ئایدۆلۆژیایەك نامێنێ.
وەختێ زمانێکی درەوشاوەم بینی
واز لە هەموو دروشمەکانی سیاسەت ئەهێ
کاتێ دڵپاکی و سینەسافیی قەڵەمێکم بینی
من بیر لەوە ناکەمەوە سەر بە کام خێڵی
ڕۆژنامەو گۆڤارە.
خۆ من لەگەڵ ئەم دەنگەدا

نە یەك گەرووومان هەبووەو
نە یەك هاواری چون یەك
نە یەك ماڵی بیروباوەڕمان بووەو

نە یەك شانە بۆ هەنگوین.
وەلێ من هەموو ئەو دەنگانەم خۆش ئەوێ
کە لە گەروویەکی پاکەوە دێنە دەرێ.
هەموو ئەو ماڵانەم خۆش ئەوێ
کە لە تەنگانەدا ماڵن بۆ هەموو شیعرێ.
هەموو ئەو شانانەم خۆش ئەوێ
با لە هەنگی دارەکەی منیش نەبن
چونکە وەك سەرئەنجام
هەر لە هەنگوینی خۆشەویستیمان ئەدەنێ!

ڕقیش ئەو کاتە وێرای بێتە ماڵمانەوە
کە من وام ئەزانی هەمووو جوانیەکان
هەر ئەوانەن کە لە باخچەکانی مندان.
کە تۆ وات ئەزانی هەموو ڕاستیەکان
هەر ئەوانەن کە لەناو سەری تۆدان.
شەڕیش هەر ئەو کاتە هەڵگیرسا
کە هەریەکەمان لای خۆیەوە
وای ئەزانی ئەم دنیایە هەر بۆ ئەوە
دوارۆژ هەر ئەبێ بۆ ئەو بێ و
ئەوانیدی چارەنووسیان هەر مردنە!

حەمەی مەلا کەریم
ئەو ناوەی نیو سەدە زیاترە
لە زاری زمانی کوردیدا ئوقڵە.
لەسەر تەختەی نووسین و
پۆلەکانی فێرکردندا تەباشیرەو
لە کوژاندنەوەی دێڕەکانداو

بۆ نووسینەوەی ڕستەیەکی جوانتر
تەختەسڕە
ئەو هەڵوێستەی نیو سەدە زیاترە
«بیارە»ی بەفرە!

من لە بێستانە گەورەکەی ئەودا
هەموو ڕووەکێك و میوەیەکم بە دڵ نییە.
من لە هەوارەکەی ئەودا هەموو دیمەنێکم
بەدڵ نییە.
بەڵام ڕووەك و میوە جوانەکان ژمارەیان زۆر زۆرترە.
دیمەنە دڵ فڕێنەکان
سیحری کارتێکردنیان لە مندا
زۆر زیاترە!

کاممان وانین؟!
کێ وانییە؟!

حەمەی مەلا کەریم
شەونخوونیە.. لە ڕەنجدا.
ڕێ کردنەوەیە.. لە شاخی ئاسنینداا.
هەڵکەندنە.. لەناو مێژوویەکی سەختا.
توانەوەیە.. لەگەڵ شەمدا.
گەڕانە.. بە شوێن نادیاردا.
هەڵگەڕانە.. بە مەحاڵدا
ساغکردنەوەی.. ئەو وشانەیە
کە جێی ساغیان تیا نەماوە!
پێداچوونەوەی.. ئەو خەیاڵانەیە
کە بە هەزار باڵ ئەفڕن.
نووسینەوەی.. ئەو چیاو پێدەشتانەیە
کە قەڵەم زۆرجار لە هەڵدێریانەوە
ئەکەوێتە خوارەوەو

لە گێژەڵووکەیاندا ون نەبێ!.
ئێمە ئەمڕۆ هاتووین بۆ ئێرە
بۆ ئەوەی ڕێز لەو دار هەنجیرە بگرین
کە سەدان بەرچنەی لە خەمی شیرینی خۆی
بەخشیوە بە هەموومان.
ئێمە ئەمڕۆ بۆیە لێرە کۆبووینەتەوە
بۆ ئەوەی بەو گۆمە بڵێین
سوپاس ئەی ئاوی ماندوویی ئەناس
بۆ ئەو هەموو جۆگانەی
ئەو هەموو ڕووبارانەی
ڕژانتە ناو دەروونی تینووی میللەتەکەتەوە!

ئێمە ئەمڕۆ بۆیە لە سایەی
ئەم خۆشەویستیەدا دانیشتووین.
بۆئەوەی: خەڵاتی بەفرو چنووری
کاوانەکانی هەورامانت بدەینێ.
خەڵاتی بەردە مۆری شیعری «خانای قوبادی».
خەڵاتی «تەلانەکان»، خەڵاتی «داربەڕۆکان»،
خەڵاتی «هانەگەرمەڵە»، خەڵاتی «خاک و
خۆڵ»، خەڵاتی پەپوولەکانی «مەولەوی»،
خەڵاتی هەناسە غەریبەکانی «نالی».
خەڵاتی ئیشراقەکانی خەڵوەتی «مەحویی».
خەڵاتی مەشخەڵی سینەی «حاجی قادری کۆیی».
ئێمە ئەمڕۆ بۆیە تۆمان هێناوە بۆ ئێرە
بۆ ئەوەی سڵاوی ئەو شیعرانەت پێبگەیێنین
کە لەناو توونی باباکاندا ڕزگارت کردن و
بردتنەوە بۆ ماڵێ و سەرلەنوێ کەوتنەوە
ڕۆیشتن و چوونەوە ناو دڵی خەڵکی.
سڵاوی ئەو حیکایەت و پەیڤ و کتێبە
پیرۆزانەی کە بووبوون بەژێر هەرەسی
بەفری مێژووەوەو تۆ دەرتهێنانەوەو

بە ئاگری ڕۆحی خۆت گەرمت کردنەوەو
سەرلەنوێ چوونەوە ناو یادەوەری خەڵکی
ئێمە ئەمڕۆ ئەمانەوێ بەتایبەتی
سڵاوو ڕێزو خۆشەویستی
هەموو ئەو چاپخانانەت پێبگەێنین بە مەکینەی
کۆن و تازەیانەوە، کە خۆیان ئەیان توانی
بێن و ئێمەیانکرد بە نوێنەری خۆیان بۆ ئەوەی
لەم ڕێزلێنانەدا لەجیاتی ئەوان دەستەکانت
بگوشین. هەر لە مەکینە خانەنشینەکانی «سلمان الاعظمي»یەوە
تا ئەگاتە سەر ئەوانەی لە کۆڵانەکانی
حەیدەرخانەدا ئەژیان و تۆیش هەموو ڕۆژێ دوو سێ
جار سەردانت ئەکردن و بە دەوریاندا ئەهاتیت و
چاوەڕێی پرۆڤەکانت ئەکردن بۆ ئەوەی دواجار
پوختەکانیان بدەیتەوە دەست. هەموویان یادت
ئەکەن: بە پلێت و قورقوشم و ڕۆڵەو بورغوەکانیانەوە.
وەك تەمەنی درێژی خۆیان هیوای تەمەن درێژیت
بۆ ئەخوازن!.

پیاوێ لە کاغەزی ڕۆژنامە
وەختێ ڕۆژنامە ئەبوو بە دەنگ و ڕەنگ و
لەگەڵ وشەدا ئەهاتنە سەر جادە!
پیاوێ لە هەناسەی نووسین
وەختێ نووسین ئەبوو بە زێ و ڕووبارو
تا ئەوپەڕی کوردستان درێژ ئەبۆوە
لە دواییشدا لە هەموو ماڵێکدا ئەبوو
بە سوراحیی پڕ لە هەوێنی جوانیی
ناو تاق و سەر ڕەفە!.

پیاوێ لە هیلاکیی
ئەو وەختەی هیلاکیی ئەبێ
بە شارای کتێبخانەو کتێبخانەیش

بە گەنم و جۆی وشەی بەردەمی ئەو خەڵکە.
ڕێزلێنانێ لە کێڵگەیەك
کە دەغڵی [illegible]
ڕێزلێنانێ لە گوڵەبەڕۆژەیەك
کە هەمیشە لەگەڵ ئازاری ئەم گەلەدا
سوڕایەوەو ڕووی لە هەتاوی دڵسۆزی
هەرگیز وەرنەگێڕا بۆ لای
[illegible]
نێزەکانی ئەم عێراقە!

پرژە پرژی خۆشەویستییەکی بۆنخۆش
بەسەر قەڵەمێکی گردەڵەدا.
قەڵەمێك ئەوەندە خۆی دادا
سەد جار نووکی شکاو
بەڵام لە چوونەوە سەر دێڕی
هیوا دەستی بەرنەدا!.

دواجار
لەم شانۆیەشەوە، لە یادگارەکانیەوە،
لە پەردەکەیەوە، لە پلیکانەکانەوە،
لە یەکە بە یەکەی کورسیەکانەوە.
لە منەوە لە جانتاکەی بن هەنگڵمەوە،
لە تازەترین شیعرمەوە، لە چاوم و
چاویلکەکەمەوە.خوازیاری تەمەن
درێژیی وەك دارگوێزێکی هەورامیی
بۆ تۆ ئەی کاکە حەمەی
هەرمێ گوڵاویی!.
سلەیمانی
٢٠٠٨/٤/١١
پەراوێز:
× ئەم پارچە پەخشانەم لە ڕۆژی ڕێزلێنانی کاکە حەمەی مەلا کەریمدا خوێندەوە.

# کاکە حەمەی مەلا کەریم، دڵنیابە..!!

عەبدوڵڵا زەنگەنە

یەکێك لەو پێناسانەی مرۆڤیان پێ دەناسرێتەوە، هەڵوێستەکانێتی، منیش بەدەست خۆم نییە لە ژیانمدا بەردەوام لەژێر کاریگەری ئەو بیرۆکەیەم، ماوەی «٢٠» ڕۆژێك لەمەوبەر، لە سەفەرێکی دووره ولات گەڕابوومەوە، خزم و ناسیاو برادەرانم، ئەوانەی ماوەی مانگێك بوو بۆم بە پەرۆش بوون، چونکە لەسەر زاری هاوسەرەکەشم پێینەوتبوون بۆ کوێ چوو بووم، بۆیە دوای هاتنەوەم، هەندێکیان دەهاتنە لام و بەسەریان دەکردمەوەو ڕووبەڕوو گلەییان لێ دەکردم، هەندێکیشیان هەر بە تەلەفۆن دوای وردە گازندە دەستخۆشیان لێ دەکردم، لەو نێوانەدا تەلەفۆنێکم لە ژمارەیەکی نەناسراوەوە بۆ هات، دوای چاك و چۆنی و خۆپێناساندن. تێیان گەیاندم ئەوان لە دەزگای سەردەم دەیانەوێ ژمارەیەکی بلاوکراوەی «ڕۆڤار «یان بۆ کاکە حەمەی مەلا کەریم تەرخان بکەن، ئەوەبوو منیش یەکسەر بیرم بۆ ئەو نامانە چوو کە لە دوو سێ ساڵی ئەو «١٠» ساڵەی دوایی لە کاکە حەمەوە بۆم هاتبوون(١)، ئەوەبوو بێ بیرکەوتنەوە لەبەردەست بوونی ئەو نامانەو لەبەردەستبوونی سەرچاوەی دیکە گفت و بەڵێنم دا:

ڕۆژێك و دوان و دەو پانزە تێپەڕین، نە نامەو سەرچاوەکانم دۆزرانەوەو نە ئەو سەرو سەربوردانەش هێنرانە سەر کاغەز کە لەم ماوەیە بە بیرم دەهاتنەوە، لەم ماوەیەشدا چەند جارێك تەلەفۆنم بۆ دەکرایەوەو گفت و بەڵێنەکانم هەر دەبوونە قسەی ڕووت و وەکو دەڵێن «قسەش ناچێتە گیرفانەوە»، لەوانەیە لاتان سەیربێت ئەگەر بڵێم لەم ماوەیەشدا بەلای کەمی دوو جاران خەونم بە کاکە حەمەو منداڵەکانییەوە بینیوە. ئێ خۆ منیش ئەوەندە بابایەکی میسالی نیم کاروبارەکانم لەسەر خەون و خەیاڵ بەڕێوە ببەم، بەلام دەزانم پەرۆشیم بۆ ئەو جۆرە کارانە چەندین جار ڕاست و دروستی ئەم لایەنەی ژیانی پێ سەلماندووم(٢)، کەواتە با ئەمجارەش بەدوای داوای خەونەکەمدا بچم و پشت بە بیرەوەرییەکانم ببەستمەوەو جارێکی دیکەش ئەوەی لە هەگبەمدایە هەڵیڕێژمەوە، بزانین چی تێدایە(٣).؟

ئاشکرایەو هەمووشتان دەزانن، ڕۆشنبیرانی کورد لە سەرەتای هەڵپەکردن و چاوکرانەوەو گڕوگاڵ کردنیان بە دنیای ڕۆشنبیری بە شیعر دەستپێدەکەن، کاکە حەمەی مەلا کەریمیش

دیارە لەم دیاردەیەی ناو کۆمەڵەکەی خۆی بەدەرنەبووە، بەلام وادیارە شیعرەکانی ئەو بە شێوازو ناوەڕۆکێکی جیاواز نووسراونەتەوە، بۆیە لەسەرەتای گرۆگاڵی ڕۆشنبیری مندا وای لە هەرزەکارێکی وەکو من کردبوو هەوڵبدەم هەندێ لەو شیعرانەی لەبەر بکەم. ئەوەتا شیعری «بەلام، دڵنیام»(٤) کە لەکاتی خۆی و لەدوای ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ لەیەك لە ژمارەکانی گۆڤاری «هیوا»ی ئەوسای «یانەی سەرکەوتنی کوردان» لە بەغدا بلاوکراوەتەوە، ئێستاش تام و چێژی خۆی لە دەست نەداوەو ناوەڕۆکەکەی خەونی هەر تاکێکی مێشك کراوەو ویژدان زیندووی ئەو کۆمەڵەی ئێمەیە، هەر ئەوسا شیعرێکی دیکەی بەناونیشانی «عۆدەی حەماڵ» لە یەك لە ژمارەکانی گۆڤاری «شەفەق »ی کەرکوکی ساڵی ١٩٦٠ بلاوکراوەتەوە، ئەمیشیان وەلامی پرسیاری دیکەمان لەبارەی ئەو پیاوە دەداتەوە.

ئەگەر بتانەوێ درێژە بە ناوەڕۆکی ئەم وتارەم بدەم، دەبێ بڵێم لە نێو ڕۆشنبیرانماندا کەم کەسم دیوە، یان هەر نەمدیون، ئەوەندەی ئەو، نەك هەر لەخەمی برادەرو دۆستە ڕۆشنبیرەکانی و ناسیاوانی بووبێت، بەڵکو ئەوەندەی ئاگام لێیەو لە هەندێ پێوەندیدارانیشم بیستووە. کەسێك نەبووە ئەوەندەی ئەو پشت و پەناو هاریکار بووبێت، ئێ برادەرینە ئەو لەگەرمەی دەسەلاتی سەدام و دارو دەستەکەشی ئەوەی کردووەو تاوەکو ئێستاش نهێنییەکانیان لای کاکە حەمە خۆی پارێزراوە.

خەسڵەتێکی دیکەی ئەو پیاوە پشوودرێژی ئەو بووە، چ لە کاری نووسین و وەلامدانەوەی و چ لە یارمەتیدانی توێژەران و خوێندکارانی خوێندنی باڵای ماستەرو دکتۆرا لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات، ئەو هەر کەسێك داوای یارمەتی لێ بکردبا لەکاتی پێویست دا، نەك هەر یارمەتی دەدا، بەڵکو لەسەر ئەرك و خەرجی خۆیشی هەموو جۆرە سەرچاوەیەکی کەوتبا بەردەست لە هەر شوێنێك با، یان وێنەی لەبەر دەگرتەوە، یانیش بە خەتە خۆشەکەی خۆی بۆی دەنووسییەوەو بۆ ئەوکەسەی دەنارد. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو زۆرجاران خۆی دەخستە بەردەم لێپرسینەوەی کەسانی دام و دەزگاکانی «ڕژێم»(٥)، من دەتوانم بڵێم ئەو، بە مەبەستی جێگۆڕکێ، هاموشۆی زۆربەی دایەرەی پۆستەی هەرە زۆری گەڕەکەکانی بەغدای دەکرد، بەمەش کەشێکی وای بۆ خۆی خوڵقاندبوو لە زۆربەی ئەم شوێنانە دۆست و ناسیاوی وای بۆ خۆی پەیدا کردبوون و کارەکانیان بۆ ڕایی دەکردو پۆستەکانی بە ئاسانی بۆ دەهات و دەچوو.

دەبا ئەوەم لەبیرنەکردباو پێتان بڵێم، سەرەتای میانەو لە نزیکەوە ناسینی من لەگەڵ کاکە حەمەو خانەوادەکەی، دەگەڕێتەوە ڕۆژانی دوای «١٠٠» ساڵەی ڕۆژنامەنووسی کوردی، بیرمە ئەوسا لەخۆ نزیك کردنەوە لێی کەمێك بە پارێزو دوو دڵ بووم، بەتایبەتی کە لەهەندێکیانم بیستبوو گوایە ئەو پیاوێکی «مولحید»ە، بەلام کە لە نزیکەوە ناسیم، هەر زوو زانیم ئەوە خەڵکە نەخۆشەکەی ئێمەیە لە هۆنینەوەو هەڵبەستنی قسەو قسەلۆکی ئاوەها بێ پەرواو ویژدان مردوون، ئەگەرنا ئەوەتا کاکە حەمە نەك هەر مولحید نییە، بەڵکو دەتوانێ وەلامی زۆر لەپرسە شەرعییەکانیش بداتەوە(٦)، ئەو بەردەوام لە خزمەتی باوکی دابوو و پەرۆشی حاڵ و باڵ و تەندروستییەکەی بوو. تەنانەت دوای لە شیرازە دەرچوونی باری ئاسایشی بەغدا لە ٢٠٠٣/٤/٩ بەدواوە، تا دوای کۆچی دوایی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و بەلاداخستنی چارەنووسی کتێبخانەو دەستنووسەکان لە مزگەوتی حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، ئەو هەرچەند داوایشی لێدەکرا، ئامادە نەبوو بەغدا جێ بهێڵێ.

سیفەتێکی دیکەی کاکە حەمە بەوەفایی و دڵسۆزییەتی بۆ بـرادەرو دۆستانی، بەتایبەتی دەستە بژێرو ڕۆشنبیران، ئەوە نەك هەر ئەوانەیان کە لە ژیاندان، بەڵکو ئەوانەشیان کە کۆچی دواییان کردووە، جا ئەوکەسانە کوردبن یان لە نەتەوەکانی دیکە بووبن، ئەوەندەی لەو پیاوە وردبوومەتەوە لەم لایەنەوەش سەردەستە بووەو هەر بارو زرووفێك هاتبایە پێش، بەشداری خۆشی و ناخۆشیانی دەکـرد. لە ١٩٩٨ بەدواوە، کە لەنزیکەوە ناسیومە، هەر بۆنەیەکی ڕۆشنبیری لە کوردستان هاتبێتە پێش. پێوەندیداران لە ڕێگەی منەوە لە کاکە حەمەیان دەگێڕایەوە، ئەو تەنانەت باکی بە ناخۆشی ڕێگەو ئاستەنگەکانی بازگەکانی ڕژێمیش نەبوو، زیاتریش حەزی دەکرد لەگەڵ محێدین زەنگەنەو عەبدولرەزاق بیمار بەیەکەوە بێنە کوردستان، بۆیە هەندێ جار ئەگەر ناوی هەریەك لەوانەی لەگەڵ نەبووایە گلەیی دەکرد، کاتێ دەهاتە کوردستانیش ئەگەر خانەوادەکەی لەگەڵ نەبوایە، شەوان بەدووقۆڵی ماڵی دۆست و خۆشەویستانی ئەومان بەسەر دەکردەوە.

هەندێ وێنەم لاهەن، ئەو سەردانانەم بیر دێننەوە، بیرمە چەند جارێك چووینەتە ماڵی د. نوری تاڵەبانی و مەلا شوکر، دووجاریش هەوڵماندا ماڵی د. مستەفا زەڵمی بدۆزینەوە، بۆمان نەچووەسەر، دیارە کۆبوونەوەو دانیشتنیشی لەگەڵ هەموو

ئەو برادەرانەی باس هەر باسی ڕۆشنبیری و چارەنووسی میللەتەکەی بوو، هیچ جارێك نەمدیوە باسی ئەم و ئەو بکات. ئینجا لە نوقورچەو لاقرتێی ئەم و ئەویش ڕزگاری نەدەبوو، بیرمە لە پێش ڕوخانی ڕژێم، کاکە حەمە کورتە وتارێکی بە زمانی عەرەبی لە دوا لاپەڕەی گۆڤاری «گولان العربی» بلاوکردەوە. تیایدا، لە پاڵ پیاهەڵدان بە شان و شەوکەتی پەرلەمانی کوردستان و دەستخۆشی فیدرالیەت. ئەو گلەیی ئەوەی لە نووسەرانی کورد کردبوو کە لە نووسینەکانیاندا بە زمانی عەرەبی «کرد»ی عارەبان بەشێوەی «کورد» دەنووسن، دیارە ئەوەش هەڵەیەکەو پێشینەی نەبووە، بڕوابکە بەشێوەیەکی وا باسی هەردوو چەمکی پەرلەمان و فیدرالیەتی کردبوو، کەم لەنووسەرانی لای خۆمان دەوێران ئاوەها بەڕاشکاوی باسی ئەو دوو چەمکە بکەن، ئینجا هەندێ نووسەرانی لای خۆمان دەمیان لێکردەوە، چ وشەو دەستەواژەی ناشیرین هەبوو بۆیان هۆنیەوە، بەڵام کاکە حەمە هەر پێیان سەغڵەت نەدەبوو، بەردەوام وەلامی پڕ بەپێستی خۆی زۆر بەنەرمی بۆی ئامادە دەکردن، چوار پێنج ساڵێك دواتر هەموو بۆچوونەکانی ئەو ڕاست و دروست دەرچوون و بەچاوی خۆم دەمدی ئەو کەسانە یەك بەیەك دەهاتنە لایی و پاکانەیان بۆ خۆیان و هەڵوێستەکانیان دەکرد.

خالێکی دیکە، کە هەر لەسەرەتای پەرۆشیم بۆ ڕۆشنبیری کوردی و ئەو جۆرە کەسانە، پێی سەرسامم، ئەو پیاوە لەسەر لێکدانەوەو سەلماندنی بۆچوونەکانی، نەك هەر بەپەرۆش بووە، بەلکو چیرە درێژیش بووە، ئەو ئامادە بووە لەگەڵ هەرکەسێك بکەوێتە مشت و مڕو گفتوگۆ تا بابەتەکەی لەگەڵ یەکلا دەکردەوە، جا یان بۆچوونەکانی خۆی بە بەرامبەرەکەی دەسەلماند یان ئەو خۆی قەناعەتی بە بۆچوونەکانی برادەرەکەی دەهێنا، بیرمە لە ساڵی ٢٠٠٢دا کاتێ هاتە سلێمانی و بەشداری لە فێستیڤاڵی یەکەمی بەدرخان کرد، دوو شەوان لەگەڵ سەلاحی موهتەدی لەسەر هەندێ بۆچوون، کەوتە موناقەشەیەکی توند تا درەنگانی شەو باسی عەرش و قورشیان دەکرد، خۆزگە ئەو وێنەیەی ئەو ڕۆژانە لەناو ئەرشیفەکەم دەدۆزرایەوە.

لە شەوانی هاوینی ٢٠٠٨دا د. کەمال فوئاد، دوو جاران لەسەر شەرەفی د. کەمال مەزهەر، کاکە حەمەو برادەرانی دیکەی لە یانەی کۆمەلایەتی زانکۆی سلێمانی دەعوەت کرد. بیرمە جارێکیان خوالێخۆشبوو د. کاوس قەفتان و مامۆستا موستەفا سالح کەریمیش لەوێ بوون، کاکە حەمە لەسەر ڕووخانی سۆڤیەت و مارکسیەت و ئەو جۆرە بابەتانە کەوتە موناقەشە تا دوای نیوەشەو هەر بەردەوام بوون. ئەو هەر کۆڵی نەدەدا. لەوانەیە لە گێڕانەوەی ئەو سەربوردانە هەندێکتان پێتان وابێ کاکە حەمە لەسەر بۆچوونەکانی کەللە ڕەقی پێوە دیاربێ. بەلام من لەم لایەنەشیانەوە ئەو پیاوە تەواو پێچەوانە دەبینم، بیرمە لەساڵی ٢٠٠٦دا، منیش لەسەر هەندێ پرسی زمانەوانی و ڕێنووسی کوردی لەگەڵی کەوتمە گفتوگۆ، چونکە ئەو لە نووسینەکانیدا، لە نێوان هەر ڕستەو ڕستەیەکی دیکەدا لەپاڵ فاریزە، یان وێرگوڵ دانان «و»ێکی لەپێش فاریزەکە دەنووسی، من دەمێك بوو ئەو شێوە نووسینەم لای لە پێشەنگای ڕۆشنبیری کوردی سەرنجی ڕاکێشابووم، کاکە حەمەش، سەرباری زمانە ڕەوانەکەی ئەو خەسلەتەی هەبوو. ئەوەبوو ڕۆژێکیان تینم دایە خۆم و بەڕاشکاوی درکاندم، چەند جارێك لەگەڵم کەوتە موناقەشە، تا دواجار پێم سەلماند، بەلام ئەو بەوەندە دڵی دانەدەکەوت و وازی نەدەهێنا، ئەوەبوو ناوی منی دابووە ئەکادیمیای کوردی لەوێ بوومە ئەندامی هاوکاریان، تا لەو لێژنەیە بەشداری لەگەڵ دا بکەم کە خۆی سەرۆکی بوو، بە هەمووومان نەیەڵین ئەو هەڵەیە چی دی بەسەر خەلکی دیکەدا تێپەڕێ، ئەوەندەی بە بیرم دێتەوە، نەمدیوە جارێکی دیکە کاکە حەمە ئەم شێوە ڕێنووسەی بەکارهێنابێتەوە. هەروا لە خۆیەوە «واو» پێش وێرگوڵ دابنێتەوە.

ئومێدەواریشم ئەو برادەرانەی کە منیان ڕاسپاردووە ئەو چەند بیرەوەرییە بێنمە سەر کاغەز، داوایان لە شیرین خانی، دایکی بیارەو ژیوارو پیران کردبێ و هانیان دابێ، تا ئەمیش قسەی خۆی لەسەر کاکە حەمە بکات، شیرین خان، کە من هەر لەسەرەتای ناسینی نازناوی مافناسی ڕۆشنبیرانم داوەتێ، ئەگەر یەکێك هەندێ بیوروژێنێ قسەی خۆی لەسەر کاکە حەمە پێ بکات، دلنیام زۆری پێیە، زۆرجاریش کە دوو بەدوو قسەمان لەم لایەنەکردووە، وردبینی ئەوم لەم بارەوە بۆ دەرکەوتووە.

پەراوێز:

١- ئەو نامانە زۆربەیان لە بارەی ئەو وتارو نووسینانەن، جا هی خۆی بووبێ یان هی دۆست و برادەرانی، لەڕێگەی برادەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە، دەینارده لای من، منیش وتارەکانم دەگەیاندە بلاوکراوەکانی لای خۆمان

٢- ماوەی دوو سێ ساڵێك لەمەوبەر، چەند ڕۆژێك لە کتێبخانەکەمدا بەدوای کتێبی «بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی» نەریمان دەگەڕام، هەر نەدەدۆزرایەوە، تا دوای نیوەشەوێك هاتە خەونم و لەخەو ڕاپەڕاندم بەرەو ژووری کتێبخانەکەم چووم، کتێبی ئاینم لە شوێنی دیاری کراو، وەك لەخەونەکەم بینیبووم لەژێر کەڵەکەبووی کتێبی دیکە دۆزیـەوە، تەنیا جیاوازی ئەوەبوو، کتێبەکە خۆی بەرگی سپی بوو، لەخەونەکەی منیش بەرگی ڕەنگاو ڕەنگ بوو.

٣- لەساڵی «٢٠٠٨»دا وتارێکم لەژێر ناونیشانی «مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم، کوردایەتی، هەڵوێست، بوێری و بەخشش» بۆ ئاهەنگی ڕێزلێنانی ئەو زاتە نووسیوە. کە حیزبی شیوعی کوردستان لە هەولێر بۆی سازکردبوو، دەقەکەی لە کتێبی «محەمەدی مەلا کەریم! شەڕکردن لەسەر جوانی» بڵاوکراوەتەوە.

٤- بەداخەوە لەم دەم و دەستەدا ئەو ژمارەیەی گۆڤاری «هیوا»م لەبەردەست نییە تا ئاماژە بە ژمارەو ساڵی دەرچوونی ئەو ژمارەیەی گۆڤارەکە بدەم کە شیعرەکەی تێدا بڵاوکراوەتەوە. ئەوەی لێرەش دەیخوێننەوە ئەوە دەقی ئەو هەڵبەستەیە وەکو چۆن لە گۆڤارەکە بڵاوکراوەتەوە. ئەوەی شایانی باسە ئەمڕۆ ئەم ژمارەیەی گۆڤارەکە بە ئاسانی دەست دەکەوێت، چونکە ژمارەکانی بەسەرپەرشتی د. هیمدادی حوسین، لە لایەن دەزگای ئاراس دووبارە چاپ کراونەتەوە

## .. بەڵام دڵنیام

**ئەترسم بمرم، نەگەم بە هیوای پیرۆزی ژینم**
**کوردستانێکی یەکگرتووی ئازاد بەچاو ببینم:**
**گەورەی وڵات بێ پاڵەو جووتیارو ڕۆشنبیرانی**
**ئیشیان تەرخان بێ بۆ ئاسایش و بۆ کامەرانی**

**دەشتی کوردستان بە هەرەوەزی هەمووی کێڵرابێ**

**تۆوی بێ ئێشی لە بەینی چینی ڕەنجبەر نرابێ**

**کوێستانەکانی وڵات هەوارگەی ڕازاوەو جوان بێ**

**جێی حەسانەوەی ساواو ڕەنجکێش و قوتابیان بێ**

**زەوی بە پیت و باخ پڕ لە میوە و باخچە گوڵزاربێ**

**پلەی ژیانی لادێیش بە چەشنی ژیانی شاربێ**

**بە دووی کارخانە بەری ئاسمانی وڵات گیرابێ**

**نیشتمان هەمووی بە داوی خەتی ئاسن تەنرابێ**

**سەرچاوەکانی سامانی وڵات بێنرێنە بەرهەم**

**بۆ قازانجی گەل، نەوەك وەك ئێستا: سەرچاوەی ستەم**

**نەخوێندەواری نەمابێ لەناو دانیشتوانا**

**دەیان زانستگا دروست کرابێ لە کوردستانا**

**لە هەموو لایەك شەقامی پان و ڕاست ڕاکێشرابێ**

**پەیکەری زاناو خەبات کەرانی تیا دامەزرابێ**

**گەل گشت تەندروست، خەستەخانە زۆر، ساوا خرپن بێ**

**مرۆڤ لە عاستی پیری و لێ کەوتن دڵی هێمن بێ**

**گڵۆپی جادەو ناوماڵ و کۆڵان وەك ئەستێرەی شەو**

**بدرەوشێنەوەو خاکی نیشتمان پرکەن لە پرتەو**

**بە هونەری بەرز، بە نووسینی ڕاست، بە ئاوازی خۆش**

**هاونیشتمانان زاخاو دەنەوە گوێچکەو چاو و هۆش**

**ساوا لە کۆشی پەروەرشگادا پەروەردە بکرێ**

**بە گیانی ئاشتی و برایی گەلان دەرزی دابدرێ**

**کۆترەکەی ئاشتی، چڵی دار زەیتوون بە دەنووك بگرێ**

**بێ ترس ناوجەرگەی ئاسمانی شینی کوردستان ببرێ**

* * *

**بەڵام، قەیناکا منیش نەیبینم، مادەم دڵنیام**

**ڕۆژێ لە ڕۆژان هیوای خەباتم ئەگاتە ئەنجام:**

**کوردستانێکی جوانتر لەمەی من دێتە سەر ڕووی کار**

**خەڵکی تیا ئەژین، بەکامەرانی و ئاشتیی پایەدار**

* * *

دەقی ئەو هەڵبەستەش لەهەر دەقێکی دیکە ڕاست و دروسترە، چونکە لە زاری کاکە حەمە خۆی ڕاست کراوەتەوە

٥- لە ساڵی ٢٠٠١، پێویستم بە هەندێ سەرچاوە بوو لەسەر مەلا مستەفای بارزانی، لە پەراوێزی کتێبەکەی خوالێخۆشبوو د. عەبدولستار تاهیر شەریفیش، کە بەناوی «الجمعیات و المنظمات الکردیە» لە هەشتاکان بڵاوکراوەتەوەو بەم دواییەش دەزگای سەردەم چاپی کردۆتەوە، خوێندبوومەوە گوایە هەمزە عەبدوڵلا هەندێ بەڵگەنامەی گرنگی لایەو نیشانی کەسیشی نادا، دیارە هەر تۆژەرێك لەسەر جەنابی مەلا مستەفا پێویستی بە بەڵگەنامەی ئاوەها دەبێ. ئەوەبوو لە کاك «ممتاز حەیدەری»م بیست کە ئەو بەڵگەنامانە لای دەستێکی ئەمینەو تۆش دەیناسی، ئەوەبوو بەدوایاندا چوومە بەغدا، کاکە حەمە بێ دڵی نەکردم، لەگەڵ شیرین خانی هاوسەری لە بەیتوونەی سەرەوەی ماڵەکەیان شوێنیان بۆ کردمەوە، ماوەی هەفتەیەك فایلەکانم دەخوێندەوە، لەسەر کۆپی کردنی هەندێ لە بەڵگەنامەکانیش لەبازاڕ گرفتمان بۆ پەیدابوو، بەشێکی ئەو گرفتانەم لە وتاری ئاماژە بۆ کراو باس کردووە، ئەوەی شایانی باسەو یەکەم جارە دەیدرکێنم هەر لە ڕێگەی منەوە بەشێك لەو بەڵگەنامانە هێنرانە بەغدا لەگەڵ هەردوو هاوکارانم ڕەفیق و سدیق ساڵح شەوێکیان هەموو وێنەی گۆڤارو ڕۆژنامە نهێنییەکانی ئەو دەورو زەمانەمان خستە دووتوێی کتێبی «ڕۆژنامەوانی نهێنی» کاکە نەوشیروان مستەفا، دوای ئەوەی بەڵگەنامەکانم بۆ کاکە حەمە بردەوە جارێکی دیکەش لەسەر ناوی خۆیان بۆم هێنانەوە کوردستان بەداخەوە بەم دواییە نازانم بۆ ئەم هەموو ماندووبوونەی من خرایە ژێر لێوەوەو چیرۆکی ئەم بەڵگەنامانە بەشێوەیەکی دیکە دەگێڕدرێتەوە، ئەوە جگە لەوەی کاکە حەمە ئەوەندە بڕوای بە من هەبووە، لەمانگی کانوونی دووەمی ٢٠٠٤، دوای ڕووخانی ڕژێم، ناچار بووم «١٧» ڕۆژان بۆ نەشتەرگەری دایکم لە بەغدا بمێنمەوە، زۆربەی ڕۆژەکان دەچوومە ماڵی کاکە حەمەو هەر ڕۆژەی فایلێکم لەگەڵ خۆم دەهێنایە شوێنی حەوانەوەم و تا بەیانی دەمخوێندنەوە،

٦- لەسەر ئەم لایەنەش هەندێ سەربوردەو مشتومڕی کاکە حەمەم لا یە.

## محەمەدی مەلا کەریم:

# ئەدەبی کلاسیکی، لایەنێکی پرشنگداری ئەدەبی کوردییە

محەمەدی مەلا کەریم، ناوبانگی لەوە گەورەترە لەم پێشەکییە کورتەدا بە خوێنەرانی بناسێنین، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم چاوپێکەوتنە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و تایبەت بۆ ڕۆڤار ئامادەکراوە، هەرچەندە ئەو باری تەندرووستیشی جێگیر نەبوو، بەڵام بە دڵێکی گەورە و میهرەبانەوە چەند سەعاتێك لە کاتمان گرت و ئەم چاوپێکەوتنەمان ڕووبەڕوو لەگەڵ سازکرد.

گرنگترین خاڵی چاوپێکەوتنەکە بەلای ئێمەوە ئەوەیە کە زۆر ڕاشکاوانە وەڵامی پرسیارەکانمان دەداتەوە، هەرگیز لە وەڵامی پرسیارێکیدا هەست بەوە ناکەین کە خۆی لە ڕاستییەکان وەلا بنێت، هیوادارین چاوپێکەوتنەکە دەروازەیەك بێت بۆ ئاشنابوونی زیاتری خوێنەران بە کار و بەخشش و بەرهەمەکانی ئەم قەڵەمە گەورەیەی پڕ ئەدەبیاتی کوردیمان.

چاوپێکەوتنی: کامەران سوبحان

**× سەرەتای ئەم دیمانە تایبەتە بۆ ڕۆڤار پێمانخۆشە باسی دەستپێکی کارەکانی خۆتمان بۆ بکەیت چ لەڕووی بەرهەمی وەرگێڕانەوە، چ لەڕووی نووسینی خۆت و ساغکردنەوەی شیعرە کلاسیکییە کوردییەکان؟**

- لەڕاستیدا دەسپێکی کارکردنی من بۆ ساغکردنەوەی ئەدەبی کلاسیکی، تا ئەندازەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ گۆڤاری (ژین) لە ساڵی ١٩٥٢ دا، ئەو کاتە لەگەڵ مامۆستا (گۆران)ی شاعیر دادەنیشتم دەمبینی زۆر سەرسامە بە شاعیرانی کلاسیك، پاشان لە کتێبخانەکەی باوکمدا دوو دیوانی (مەولەوی) م بینی کە خۆی لەسەردەمی فەقێیایەتیدا نووسیبوونیەوە، دیارە ئەویش لە لایەن کەسانێکەوە دەست کەوتبوون کە شیعرەکانی مەولەوییان لە لابووە، ئەوەبوو ئەو دوو دیوانەم لەکتێبخانەکەی باوکمدا خوێندەوە، لەم ڕووەوە سەرسامیم پەیدا کرد بۆ شیعری مەولەوی، ساڵی ١٩٥٧ کە لەزیندان هاتمە دەرەوە ماڵمان باریکردبوو بۆ شاری کەرکوك، لەوێ لەتەکیەی تاڵەبان سەیرم کرد باوکم وەك جاران سەرقاڵ نییە بە کارو وانە وتنەوە بە فەقێکانی، وەك چۆن پێشتر لە بیارە و سلێمانی بە گڕوتینەوە کاری دەکرد، ڕۆژێك وتم باوکە بۆچی خەریکی دیوانی مەولەوی نابیت منیش یارمەتیت دەدەم؟ بەم قسەیەی من ڕازی بوو، ئەوەبوو پێکەوە دەستمانکرد بە ساغکردنەوە و لێکدانەوەی شیعرەکانی مەولەوی، هەر لەو قۆناغەشدا لە شاری کەرکوك کەسێکم بەناوی ( شێخ ڕەئوفی خانەقا)ناسی، ناردی بەدووامدا و لە کتێبخانەی گشتی وەك فەرمانبەر دایمەزراندم، ئیتر بەهۆی دوورکەوتنەوەی من و برا گەورەکەمەوە ئیش و کارەکان هەمووی کەوتە ئەستۆی باوکم، ئەو خۆی بەتەنیا دیوانی شاعیرەکانی ئەدەبی کلاسیکی دەنووسییەوە و لێکدانەوەی بۆ دەکردن، دووای ئەوە من چوومە بەغداو لە ( ئیسلاحی زەراعی) دامەزرام، پاشان گەڕامەوە بۆ کەرکوك، زۆری نەبرد بەهۆی دەرچوونی ڕۆژنامەی ( ئازادی )یەوە گەڕامەوە بۆ بەغدا و لەوێ کارم کرد هەتا ڕۆژنامەی ئازادی داخرا، پاشان چوومەوە بۆ ( ئیسلاحی زەراعی) و لەوێ دامەزرامەوە و لەبەشی کوردیەکەی گۆڤارەکەی ئەوێدا کەوتمەوە کارکردن لە بواری ساغکردنەوەو نووسینەوەی ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی، ئەمە سەرەتایەکی گشتی بوو لەو قۆناغەی کە خۆم و باوکم دەستمان کرد بە ساغکردنەوەی شیعری شاعیران.

**× ئەی لەو قۆناغەدا ئێوە لە گۆڤاری شەفەق دا کارتان نەدەکرد؟**

- بەڵێ کارم دەکرد، شەفەق لە کەرکوك دەردەچوو، ماوەیەك ویستم بابەتی تێدا بنووسم، بەڵام دوواتر تێگەیشتم کە باشترە تێیدا نەنووسم، دەنگۆی ئەوە هەبوو کە گۆڤارەکە شیوعیەکان تێیدا دەنووسن، بەڵام من گوێم نەدەدایە و بەردەوام گۆڤارەکەم دەخوێندنەوە و سەردانیشم دەکردن، بەڵام هیچم نەدەنووسی هەتا دووای چواردەی تەمووز، ئەوکاتە خوالێخۆش بوو د.مارف خەزنەدار لێپرسراوبوو لە گۆڤارەکە، بەڵام شێخ مارف بەرزنجی و شێخ حسێنی لەگەڵدا بوو، ڕۆژێك شێخ ڕەئوف پێیوتم شێخ قادری بەرزنجی دەیەوێت بیبینیت، ئەوە بوو چووم بۆ ماڵیان و پێی وتم مەلا محەمەد ئەم ڕۆژە ڕۆژی تۆیە، وتم یانی چیی ڕۆژی منە؟ وتی ئەوە چواردەی تەمووز ڕوویداوە و شۆڕش بەرپا بووە و مارف خەزنەدار لەگەڵ حەمە ساڵەح دیلان ڕۆشتوون بۆ دوکان بۆ سەیران، دەبێت تۆ ژمارەیەکی تازەی گۆڤارەکەمان بۆ دەربکەیت، دوواتر پەیوەندیم کرد بە کۆمەڵێك کەسی وەك مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی و شێخ موکەڕەم تاڵەبانی و شێخ حسێنی شێخ مارف و فەیمی عەبدولڕەحمان سەعید و کاك فاتیحی برام و دکتۆر نووری تاڵەبانی، کە ئەوکاتە خوێندکاری حقوق بوو، ئەمانە هەریەکەو بابەتێکیان بۆ گۆڤارەکە نووسی و ژمارەیەکی تازەمان دەرکرد، کاتێ مارف خەزنەداریش لە دوکان هاتەوە ئیدی هەر نەهاتەوە بەلای گۆڤارەکەدا و من هەتا سەرەتای ساڵی ١٩٥٩ شەش ژمارەم لە گۆڤاری شەفەق دەرکرد، دووای ئەوە من گەڕامەوە بۆ شاری کەرکوك و گۆڤارەکەیان دا بە (حەمید عوسمان)، وابزانم ئەویش سێ چوار ژمارەیەکی دەرکرد، ئەو کاتە مامۆستا گۆران بە شێخ قادر بەرزنجی وتبوو با ئەم گۆڤارە ببەین بۆ سلێمانی و بیکەین بە گۆڤاری ئاشتیخوازان، ئەوەبوو هێنایانە سلێمانی و ناویان نا گۆڤاری بەیان، هەتا کاتی نەخۆش کەوتنی مامۆستا گۆران، سێ ژمارەی لێدەرکرد.کە نەخۆش کەوت دایانەوە بە شێخ قادرو حەمید عوسمان سەرپەرشتی دەرچوونی کردەوە هەتا ئەو ڕۆژەی داخرا.

**×ئەی چۆن بوو دوای ئەوە بە ماڵەوە چوونەوە بۆ بەغدا؟**

- وابوو، دوای ئەو ڕووداوەش پاش ماوەیەك باوکیشم هاتە بەغدا، چونکە کۆمەڵێك خوشك و برام لەکەرکوك گیرابوون، کە هاتە بەغدا لە مزگەوتی حەزرەتی غەوز دامەزرا و لە مزگەوتی ئەحمەدیش بوو بەئیمام و وتاربێژ، لەو کاتەدا شێخ محەمەدی قزڵجی مودەڕیسی حەزرەتی غەوز بوو چووە جێگەکەی، دواتر من داوایەکم پێشکەشی وەزارەتی پەروەردە کرد کە دیوانی مەولەویمان بۆ چاپ بکەن، بڕیاریاندا چاپی بکەن، تەقدیریانکرد بە بیست مەلزەمە و هەر مەلزەمەی بە دە دینار، من پێشتریش لە دائیرە هەتا نیوەڕۆ کارم دەکرد، پاش ئەوە کاتەکانم تەرخان دەکرد بۆ دیوانەکەی مەولەوی و بە خەتی خۆم دەمنووسییەوەو دواتر پاکنووسمان دەکرد.

**×وابزانین باوکت لە بنەڕەتدا هەورامی نەبوو، ئەی چۆن توانی ئەو ساغکردنەوە و لێکۆڵینەوانە بۆ شاعیرانی کلاسیکی کوردی بکات لەو قۆناغانەدا؟**

-ئەمە زۆر ڕاست و تەواوە، بەڵام باپیری باوکم بە ڕەچەڵەك خەڵکی گوندێکن لە پشت سەراوی سوبحان ئاغاوە لە شارەزوور پێی دەڵێن ( ماین دۆڵ)، لەناو باپیرانمدا شەڕێك ڕوویداوە تەنانەت کوشتنیشی تێکەوتووە، ئەوە بووە هۆی ئەو گوندەیان جێهێشتووە و گەیشتوونەتە تەکیەی لای خورماڵ، لەوێشەوە چوونەتە مەریوانی کوردستانی ڕۆژهەڵات، باوکم لە مەریوان لەدایك بووە، کاتێکیش باوکم لە بیارە بووە پیاوێك هەبووە ناوی مەلا حسێن بووە، کوڕی مەلای بیارە بووە، کەسێك خەبەری دابوو کە گوایە شێخ عەلادین چووە ئێرانی هێناوە و دایناون لە بیارە، باوکم و شێخ حسێن و کاتبەکەی و کۆمەڵێکی دیکە بوون ناسنامەی عێراقیان دەرهێنا لەسەر ئەساسی گوندی دەرەشیش کە گوندێکە لە نزیك هەڵەبجەیە، تەنانەت پیاوێکی دەرەشیشی هەبوو ناوی حەمە سەعی بەگ بوو، لە مەحکەمە سوێندی خواردبوو وتبووی من بیرم دێت مەلا کەریم لە دەرەشیش لەدایك بووە، ئیتر ئەوە بوو باوکم لە کتێبەکانیا هەر ڕۆژەی شتێکی دەنووسی، ڕۆژێ دەینووسی دەرەشیش و ڕۆژێ دەینووسی تەکیەی خورماڵ، من هەر کتێبێکم بۆ چاپ کردبێ دەمنووسی یەکێك لە دێهاتەکانی کوردستان، بۆ ئەوەی دەقیق تر بێت بە باوکیشم دەوت. ئەمە بۆ ئەوەبوو هەمیشە پێشی دەوتم هەر جارەو ناوی شوێنێك بنووسە.

بێینەوە سەر دیوانەکەی مەولەوی، ئەو کاتە من مەلزەمە بە مەلزەمە ئامادەم دەکرد و دەمدا بە چاپ، مەولەوی شیعرێکی هەیە بەسەر سوتانی کتێبخانەکەیدایە، بەڕێکەوت کاتێ دیوانەکەی چاپ دەکرێت لەکاتی چاپکردنی ئەو مەلزەمەی کە شیعرەکەی تێدایە و باسی سوتان دەکات بە ڕێکەوت چاپخانەکە دەسوتێت و گڕ دەگرێت، وتم بەخوا مەولەوی شانسی نییە و بەو حاڵەوە دیوانەکەیمان چاپ کرد و بڵاومان کردەوە کە زۆر دەردەسەری و ماندووبوونمان لەگەڵدا کێشا.

**×دیوانی مەولەوی یەکەمین دیوانی شیعری کلاسیك بوو کە ئێوە ساغتان کردەوەو چاپتان کرد؟**

-بەڵێ ئەمە یەکەم دیوان بوو. دوای ئەوە شێخ محەمەدی مەحوی، لەگەڵ مامۆستا گۆران و کاکەی فەلاح لە دائیرەی ئەشغاڵ بوون، خەریکی دیوانی مەحوی بوون، لە سەرەتادا شیعرەکانیان ساغ کردبوویەوە، لەسەر ئیملای کۆن خوێندبوویانەوە و ساغیانکردبوویەوە و نووسیبوویانەوە، بەڵام کاتێك ئەوان دیوانەکەی مەولەوییان بینی، وتیان دەینێرین بۆ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس چاپی بکات، باوکم چاکی کردو دای بەدەست منەوە و منیش پێیدا چوومەوە، بەڵام لەوکاتەدا کە بە دیوانەکەی مەحویدا دەچوومەوە من دیسان گیرامەوە، دواتر شێخ محەمەدی مەحوی هاتبوو بۆ لای باوکم و نووسخەکەی بردبوویەوە، بەڵام هەتا من پاش سێ ساڵ لە زیندان هاتمە دەرەوە، ئەوان هیچیان نەکردو چاپیان نەکرد، کە هاتمە دەرەوە شێخ محەمەدی مەحوی نووسخەکەی خۆیانی هێنایەوە، من پێیدا چوومەوە و چاپمان کرد، هەر لەوکاتەدا باوکم دەستی کرد بە دیوانی نالی، کاك فاتیحی برام پێیدا دەچوویەوە و پاشان ئەویشمان نارد بۆ چاپکردن، ئەوەشمان بیر نەچێت هەر لەو ساڵانەدا واتە حەفتاکان، باوکم دیوانی بێسارانیشی چاککرد و پێیدا چوویەوە، بەڵام هەتا ئێستاش نەمان پەرژاوە چاپی بکەین، بەهیوام لەپێدا چوونەوەی سالم ببمەوە و بچمەوە سەر دیوانەکەی بێسارانی و پاش پێدا چوونەوە ئەویش چاپ بکەین، سالم ڕاستە چاپ بووە، بەڵام پڕە لەهەڵە و کەموکوڕی، ئێستا سەرقاڵی چاککردنی ئەو هەڵانەم و بە نیازم دیسانەوە بە شێوازێکی نوێ چاپی بکەمەوە، کاتێکیش کە دیوانی نالیمان چاپ کرد، پشتمان تەنها بەیەك سەرچاوە نەبەست، بەڵکو کۆمەڵێك نالی ناسیشمان پەیداکرد و بەراوردو لێکۆڵینەوەی تەواومان بۆ کرد بۆ ئەوەی شتێك دەربچێت پوخت و بە کەڵك بێت بۆ کتێبخانەی کوردیمان.

**× لەسەرەتای نەوەدەکانەوە و پێشتریش شتێك لەسەر ئەدەبی کلاسیکی کوردی دروست بوو، ئەویش ساغکردنەوەی شیعرە، بۆ نمونە هەندێك شیعر هەیە کەس نازانێت هی سالمە، یان هی نالییە، یاخود مەحوی، ئێوە لەم بارەوە تووشی گرفت و کێشە نەبوون؟**

- لە ڕاستیدا کەم کێشەی لەو شێوەیە هەبووەو ڕووبەڕووی ئێمە بێتەوە، ڕێکەتووە و دیقەتمان داوە، بۆنموونە لە شیعری ( بێتۆ... بێتۆ) کەی نالیدا کە (کوردی) شاعیریش شیعرێکی لەو بابەتەی هەیە، ئێمە دوای بانگەوازەکەمان کە داوامان کردبوو کێ دیوان و دەستنووسی نالی هەیە بیهێنێت بۆمان بێنێت بیست و سێ نوسخەمان دەستکەوت، تاکو ئێستا کەس ناناسم لە ئەدەبی کوردیدا هێندەی نالی شیعری زۆری دۆزرابێتەوە، ڕۆژێك کوڕە مەلایەك هات بۆ لامان و وتی من خەڵکی ئێرانم و لێرە ڕەگەزنامەم دەرکردووە و ئێستا لە کۆلیژی شەریعە دەخوێنم، وتیشی لەناو کەلوپەلەکانی باوکما ئەم شیعرەمان دۆزیوەتەوە لێی نووسرابوو هیی نالییە، هەر واشبوو شیعرەکە لەسەدا سەد هیی نالی بوو، ئێمەش لە بەرگی دیوانەکەیدا دامانناوە، کەسێکیش هەیە برادەرمان لە لەندەن ناوی ئەنوەری سوڵتانییە، نامەیەکی بۆ ناردم نووسیبووی لە کتێبخانەیەکی

لەندەن دیوانێك هەیە بەناوی دیوانی شێخ عەبدولغەفاری مەردۆخییەوە، خۆی دیوانەکەی نووسیبوویەوە و داوای لەمن کرد لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکەم، چونکە ئەو پێیوابوو ئەوانە شیعری بێسارانین، شێخ عەلی قەرەداغی لە کتێبخانەی شوێنەوار بوو کتێبێکی دۆزیبوویەوە، کە کتێبی کابرایەك بووە لە (حوجرە) ئەو کتێبە لە حاشییەکانی خوارەوەی شیعری بێسارانی بوو، دیارە کابرا لەو سەردەمەدا لاپەڕەی دەس نەکەوتووە، بۆیە لەوێدا نووسیوویەتی، ئیتر من هەموو ڕۆژێك دەڕۆیشتم بۆ کتێبخانەی شوێنەوار و دیوانەکەم دەنووسیەوەو دانەیەکیشم بۆ خۆم کۆپی کرد، پاشان ئەنوەری سوڵتانی نامەیەکی نارد و پێی وتم ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە بەناوی شێخ عەبدولغەفار مەردۆخییەوەیە و بۆمان دەرکەوت هیی بێسارانییە، بەڵام ئەو لە لەندەن هەر بەناوی شێخ عەبدولغەفاری مەردۆخییەوە چاپی کرد و منیش پێشەکییەکەم بۆی نووسی، خۆشی پێشەکییەکی نووسیبوو کە ئەمانە شیعری بێسارانین.

**×بەڵام ئەوەش بزانە لەو شاعیرە کلاسیکییانەی ئێوە ساغتان کردوونەتەوە، نالی زۆرترین قسەو گفتوگۆی درووستکرد، بەرای تۆ هۆکاری ئەمە چییە، ئایا پەیوەندی بە ساغکردنەوەکە ئێوەوە هەیە، یان پەیوەستە بە خودی شیعرەکانی نالییەوە؟**

- دیارە ئەو شیعرانەی نالی بەبێ ساغکردنەوە کەس سوودی لێنابینێت و کەسیش لیی تێناگات، چونکە ئایەت و فەرمووده و ڕەوانبێژی و زۆر شتی تری تێدایە، ئەو دیوانە من پێیدا چوومەتەوە، باوکم و فاتیحی برام لە ساغکردنەوەکاندا ئاماژەیان بەوە کردووە کە ئەم شیعرانە لە چ بابێکی عروزییە ڕۆڵیان هەبووە، دیارە کۆمەڵێك لێکۆڵیار و نووسەریش لەوانە ڕێبوار سیوەیلی لێکۆڵینەوەیان لەو بارەوە کردووەو دواتریش کردی بە کتێبێك و بۆچوونی جوان و تازەشی لەسەر نالی وتووە لەو کتێبەدا، بەڵام بە نیسبەت مەحوییەوە تاکو ئێستا دوو سێ شیعریمان بە خەتی خۆی دەستکەوتووە، کە ماڵی مەحوی هەتا ئێستاش ماون، ئەگینا دیوانەکەی یەك نوسخەی خەتی خۆی نەبووە، نازانم ئەمە چۆن بووە فەوتاون، یان هۆکەی چییە، بەڵام خەتەکان زیاتر هیی کوڕی یان کوڕەزاکەیەتی کە شیعرەکانی بۆ نووسیووەتەوە.

**× بەڕای تۆ ئەمە گومان درووست ناکات لەسەر شیعری مەحوی، کە یەك دێڕ شیعری بە خەتی خۆی نەماوەتەوەو هەمووی بۆیان نووسیووەتەوە؟**

- باوەڕ ناکەم گومان درووستبکات، بەڵام ئەوەش بڵێم ڕەنگە هەندێك گۆڕانکاری هەبووبێت لە وشەکانی شیعرەکانی مەحویدا، بەڵام شیعری مەحوی هەرچەندە ئاسانترە لە چاو شیعری نالیدا، بەڵام هەموو کەسێك ناتوانێ شیعری مەحوی بڵێت، چونکە بەڕاستی مەحوی شاعیرە، واتە کەسێك شیعریی

مەحوی نووسیبێتەوە بیکات بە شیعری خۆی ڕەنگە ئەمە مەحاڵ بێت.

**× ساڵی پار وەزارەتی ڕۆشنبیری دیدارێکیان بۆ مەولەوی سازکرد، یەکێك لە دکتۆرەکانی زانکۆی سنە لێرە بوو، من دیدارم لەگەڵدا سازکرد ئەو وتی، دەبێت ئەدەبی کوردی سوپاسی بنەماڵەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بکەن، ئەگەر ئەوان نەبونایە بەم شێوە ئەدەبی کلاسیکیمان نەدەبوو، بەڵام سەرنجێکی هەبوو بەوەی دەبوو ئێوە خوێندنەوەیەکی تازەتان بۆ ئەو دیوانانە بکردایە، نەك بە تەنها ساغکردنەوە ودانانی شیعرەکانتان چاپ بکردایەتەوە، ڕای تۆ لەو بارەیەوە چییە؟**

- ئەگەر ئێمە خوێندنەوە بکەین بۆ ئەو شیعرانە ئەوە شتێکی ترە.. دیارە نالی بە چوار پێنج مانا دەبێت و دەیان خوێندنەوەی جیاوازیش هەڵدەگرێت، مەحوی و سالم و شاعیرانی تریش بە هەمان شێوە، من کتێبەکەی کاك مەسعود محەمەدیشم هەیە کۆمەڵێك ڕەخنەی لە ئێمە گرتووە، خۆ کاك مەسعود محەمەد خۆی بەر لەوەی ئێمە دیوانی نالی چاپ بکەین، کتێبی چەپکێك لە گوڵزاری نالی چاپکرد، هەوڵی داوە بەو شێوەیەی ئێوە دەیڵێن شەرحی دیوانی نالی بکات، بەڵام نەیکردووە، ئێ باشە کاك مەسعود محەمەدی خوالێخۆش بوو کە خۆی نایکات بۆ ڕەخنە، لە ساغکردنەوەکەی ئێمە دەگرێت، بەو حاڵەشەوە من ئەگەر بۆم بکرێت بچمەوە سەر دیوانەکەی نالی شتی تازە دێتە خەیاڵمەوەو جارێکی تر بە شێوازێکی تازەتر دیوانی نالی چاپ دەکەمەوە، من کە دیوانی مەولەویم نووسییەوە، کۆمەڵێ ئاماژەو دەلالاتم بۆ پەیدا بوو، بەڵام بەداخەوە نەمکرد لەکاتی خۆیدا بیاننووسمەوە، بەڵام مەرج نییە ئێمە، با کەسانی دیکە بیکەن، ڕەنگە لە زانکۆکانی ئێراندا بە حوکمی ئەوەی فارسی دەخوێنن و مەلای شارەزا تری تێدایە بتوانن خوێندنەوەی تازە بۆ شاعیرانی کلاسیکی بکەن، هەربۆ ئەو لایەنەش تا ئێستا زۆر بەداخەوەم لەو کاتەدا کە مامۆستا شێخ موحەمەدی چرۆسانی لە مزگەوتی نەقیب پێش نوێژ بوو، نەچوومە لای تا ئەو کات دیوانی نالی لا بخوێنم، ئەو کات ئەو هزرە کراوەم نەبوو، چونکە مامۆستا چرۆسانی زۆر بە وردی ئاگای لە شیعری نالی بوو، هەموو لایەنە شاراوەکانیشی دەزانی و نالی ناسێکی زۆر باش بوو.

**× ئێوە لەگەڵ ئەوەی ئەو ماوە زۆرە سەرقاڵی ساغکردنەوەی شیعری کلاسیکی کوردی بوون، لە هەمان کاتیشدا کاری ڕۆژنامەنووسی و وەرگێڕان و ساغکردنەوەی بابەتی ئەدەبی ترتان کردووە، ئەم فرە کارکردنە لە زۆر لایەندا زیانی بە بەرهەمی ئەدەبیتان نەگەیاندووە؟**

- من لەسەر ئەو پرسیارەتان دەمەوێت شتێکت بۆ باس بکەم، من ئەو کات لە مۆسکۆ بووم هەواڵی کۆچی دوایی خوالێخۆش بوو ڕەفیق چالاکم بیست، پێشتر من ڕەفیق چالاکم نەبینی تا لە برایەتی یەکمان گرتەوەو یەکمان بینی، کە ساڵح یوسفی لە ڕۆژنامەی برایەتی کە ئەو کات ناوی (برایی) بوو دایمەزراندم، ئەوەی لە بیرم مابێت «من و شێرکۆ بێکەس و د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ و ڕەفیق چالاك بووین.»
هەر لە مۆسکۆ وە وتارێکم لە (تاخی) نووسی بەناونیشانی (الان حق القول- ئێستا کاتی ڕاستی وتنە) من لەو وتارەمدا بۆ ڕەفیق چالاکم نووسیووە کە تۆ پیاوێکی زیرەك و بەهرەدار

و به توانا بوویت، ئەتزانی میللەتەکەت لە هەموو بوارێکدا پێویستی بە خزمەتە، بۆیە تۆ لە هەموو بوارێکدا ئیشت دەکرد، کە چووشیتە بواری سیاسییەوە بۆ ئەو بوارە نەدەشیایت.»

منیش بۆ پرسیارەکەی بەڕێزتان سەبارەت بەو فرە ئیشییە بە هەمان شێوە کە زانیم میللەتەکەم لە هەموو بوارێکدا پێویستی پێمە وەك ڕەفیق چالاکی ڕەحمەتی، لە هەموو بوارێکی ئەدەبی و سیاسیدا تاقی کردنەوەی خۆمم کرد، ئیتر نازانم لە کامیاندا سەرکەوتوو بووم.

**× وەك هەموومان دەزانین ئێوە کوڕی پیاوێکی ئاینی دیاری کوردستانن، بەڵام لە ژیانی سیاسیتاندا بیروباوەڕێکتان هەڵبژارد پێچەوانەی بیروباوەڕی بنەماڵە و خێزانەکەت بوو، کە بیروباوەڕی مارکسییانەیە، ئایا ئەم بیروباوەڕە کێشەی بۆ درووست نەکردوویت؟**

- لە ڕاستیدا باوکم پێی ناخۆش بوو ئێمە نزیکی سیاسەت بکەوینەوە، لەبەر ئەوەی گرفتمان بۆ درووست نەبێت، ئەگینا ئەو هیچ ڕێگرییەکی لە ژیانی سیاسی ئێمە نەکردووە، لە کاتی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسمدا من و سەڵاحی برام بەیاننامەی حیزبی شیوعیمان بۆ باوکم خوێندووەتەوە و گوێی بۆ دەگرتین و هیچ گرفت و موعارەزەیەکیشی نەدەکردین، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر خوێندەواری و هزر کراوەیی باوکم وەك مەلایەکی ئاینی بەناوبانگی کوردستان و عێراق، بەڵام باوکی ڕەحمەتیم دەیویست گرفتی ڕامیاریی بۆ درووست نەکەین و پێیخۆش بوو ئێمە ببین بە مەلا، تەنانەت کاتێك کۆلیژی شەریعە درووست کرا، داوام لێکرد بچمە ئەو کۆلیژە، بەڵام ئەو نەیهێشت، عەبدولڕەحمان خزر بەڕێوەبەری گشتی ئەوقافی ئەو کاتەی عێراق هاتە بیارە، بە باوکمی وت با بیبەین بۆ کۆلیژی شەریعە باوکم ڕازی نەبوو، دەیوست ببم بە مەلای دێیەك کە نزیکی بیارە بوو ناوی (خاگێلان) بوو، دەیان جار لەگەڵ باوکمدا دیالۆگی هزری گەورەمان پێکەوە سازکردووە لەسەر پرسی ئاین و بیروباوەڕ و لایەنی گرنگی کۆمەڵگە، بە تایبەتیش لە بارەی بوون و نەبوونی خودا، کە ئەمە بۆ ئەو کات ڕەنگە زۆر قورس بووبێت، کە پیاوێکی ئاینی وا گەورە ئەو گفتوگۆیانە لەسەر بوون و نەبوونی خودا بکات، باوکم باوەڕدار بوو زانایەکی ئاینی بەناوبانگ بوو، هەمیشە یادی خوای دەکرد و باوەڕی پێی هەبوو، بەڵام من کە کوڕی ئەوم ناتوانم بڵێم باوەڕدارم، بەڵام ناشتوانم بڵێم بێ باوەڕم، من هەمیشە پیاوێکی گوماناویم و گومانم هەیە لە بوون و چەمکە میتافزیکییەکان ئەو گومانەشم نەشاردووەتەوەو چەندین جار لە ڕۆژنامەکاندا بە ئاشکرا باس کردووە.

**× ئەو گومانە چەندێك پەیوەستە بەو شێوە گومانە بەردەوامە میتافیزیکییەکانی مەحوی شاعیر، کە تۆ لەگەڵ باوکت دیوانەکەیتان ساغ کردووەتەوەو چەندین جاریش وتووتە مەحوی بەدەر لە لایەنی ئەدەبی ئەو لە لایەنی کۆمەڵایەتی و میتافیزیکییدا مەزن و گەورەیە ؟**

- ڕەنگە پەیوەستیش بێت بەوەوە بۆ نا، بەڵام نامەوێت بیشارمەوە، لە ڕاستیدا من جیاوازتر لە خەڵك مەحوی دەبینم، لای من مەحوی چاکسازێکی کۆمەڵایەتییەو هەمیشە دژی بنەماڵەی شێخان بووە، ئەو لە شیعردا تایبەتمەندییەتی هەیە و ئەو تایبەتمەندییەش دەگەڕێتەوە بۆ تەریقەتی نەقشبەندی کە بنەمایەکی سەرەکی شۆڕشگێڕی تێدایە، هەندێ لەم بۆچوون و شیعرانەشم لە پێشەکی دیوانەکەیدا نووسیووە، بەڵام لەگەڵ ئەو بیرە چاکسازییەیدا نەگەیشتووەتە کۆتایی و ئەنجام، وای زانیبووە پیاوی خراپ خۆیانن و عوسمانییی باشتر و لە خوا ترسترن، کە دواتر عوسمانییەکان نەفییان کردووە بۆ بەغدا و لەوێشەوە بۆ مەککە و بۆ حەج و دواتریش دەچێتە ئەستەمبوڵ و سوڵتان عەبدولحەمیدی بینیووە، دواتر هاتووەتەوە بۆ کوردستان، لەبەر هەموو ئەمانە ئەو بیرە شۆڕشگێڕییەی کە هەیبووە نەیتوانیوە بیگەیەنێتە ئەنجام، من ئەمەم وتووە لەسەر مەحوی بەداخەوە بنەماڵەکەی نیگەران بوون و کتێبێکیان لەسەر نووسیم.

**× لە هەندێ لە بۆچوونەکانتەوە هەست دەکەم ئێوە بەجۆرێك لەجۆرەکان پێتان ناخۆشە بۆچونێکی جیاواز لەسەر مەحوی و نالی هەبێت، بێگومان ئەمەش سنووردانانە بۆ بەهای شیعر، تۆ پێتوانییە ئەم خوێندنەوە جیاوازانە بۆ ئەو شاعیر و شیعرانە هۆکەی بۆ پێگە و بەهای بەهێزی شیعری کلاسیکیمان دەگەڕێتەوە؟**

- ئەوە بابەتێکی دوورودرێژە و پرسیارێکی زۆر جوانیشە، دەتوانم پێت بڵێم تەنانەت باوکم کە شەرحی نالی یان مەحوی کردووە، بەو شێوە قووڵە لێی نەڕوانیووە، تەنها ویستوویەتی مانای شیعرەکە لێك بداتەوە، ئەگەر نا وەك چۆن خەریکی کتێبەکانی تر بوو، یان وەك چۆن گرنگی بەو بابەتانە دەدا کە فەقێکانی پێویستیان پێبو و پرسیاریان لەسەر دەکرد، ئاواش گرنگی بەو بابەتە بدایە دەیتوانی تەفسیری جیاوازتر و قووڵتر بکات بۆیان، من بەڕای خۆم پێموایە کاك فاتیحم لە باوکم زیاتر بۆ ئەو مەسەلەیە ڕۆشتووە ڕەنگە خۆشم لەوان باشتر بۆی چووبێتم بە تایبەت کە لە نووسین و تێبینیەکانمدا ڕای خۆم نووسیووە لەسەریان و کتێبێکم لەسەر نالی نووسیووە کە کۆمەڵێ شت بووە لەسەر نالی و بۆچوون و تێڕوانینی خۆم بووە لەسەر نالی بەناونیشانی (نالی لە کلاوڕۆژنەی

شیعرەکانییەوە)، بۆ نموونە لە شیعرێکییەوە کە دەڵێت چوومەتە میسر، من لەو شیعرەوە ئەوەم نووسیووە کە نالی لە میسرەوە چووتە شام و ماوەیەك لەوێ ماوەتەوە ئەوسا چووەتە ئەستەنبوڵ، بەڵگەش بۆ ئەمە تەنها شیعرەکەیەتی، لەم کۆتاییانەدا دەرکەوتووە کەی نالی مردووە، ئەویش کاتێك نووسەر و توێژەرێکی فەرەنسی هاتووەتە شام، ئەحمەد پاشای بابانی بینیوە، ئەمەش د.مارف خەزنەدار ئاشکرای کردووە، دواتریش عەبدوڵڵا حەداد بە دوورودرێژ لەسەری نووسیوە، کاتێك ئەحمەد پاشای بابان قسە دەکات و دەڵێت پار کە نالی مرد، بەرواری ئەو کاتەی خۆشی داناوە، لەمەوە ساڵی کۆچی دواییەکەی نالی ئاشکرا بووە، پێش ئەمە هیچ کەسێك نەیزانیوە نالی لە چ مێژوویەکدا کۆچی دوایی کردووە، محەمەد ئەمین زەکی بە هەڵە مێژووەکەی نووسیوە، مامۆستا عەلادین سەجادیش بە هەمان شێوە مێژووی مردنەکەی بە هەڵە نووسیوە، لەلایەکی تریشەوە نالی کوڕی کابرایەکی جوتیاری شارەزووریی بووە لە خاك و خۆڵ، کێ مێژووی میلادی نالی دەپرسێت لە شارەزوور، ئەمەی من کردوومە بۆ بەرواری لە دایك بوونەکەی نالی جۆرێك لە شیکار و خوێندنەوە، بۆیە هەرگیز پێمان ناخۆش نیە هیچ نووسەرێکی کورد باسی شاعیرانی کلاسیکی کوردی بکەن و شیعرەکانیان خوێندنەوەی بۆ بکەن، من پێشتر باسی ڕێبوار سیوەیلیم کرد کە کتێبێکی لەسەر نالی نووسیووەو خوێندنەوەی جیاواز و جوانی بۆ کردووە، پاشان ئێمە نووسیوویشمانە تەنها شەرح و ساغکردنەوەی ئەو شاعیرە کلاسیکانەمان کردووە نەك ئەوەی بێین شیکار و خوێندنەوەو توێژینەوەیان لەسەر بنووسین، وابزانم ئەم دوو شتەش لە یەکتری جودان .

**× ئەمانەی تۆ باسی دەکەیت هەست ناکەیت کاری زانکۆکانی کوردستانە کە بە شێوەیەکی قووڵتر بە شیعری کلاسیکیدا بچنەوە و خوێندنەوەی تازەی بۆ بکەن، نەك کاری تاکە کەسی ؟**

- بەڵێ کاری تاکە کەسی و زانکۆکانیشە، لەو بوارەدا کاریش کراوە لەسەری، بەتایبەت ئەوانەی مەسعود محەمەد شتی تازەی لەو بوارەدا تێدایە، بەڵام ئەو شتە تازەیە وەك پێویست نییە، مەسعود محەمەد لەسەر (نالی و مەحوی)ی نووسیووە، نووسینەکە قسە هەڵدەگرێت، بەڵام هەر خوێندنەوەیە و دەچێتە ئەو چوارچێوەیەی کە ئێوە پرسیاریی لەسەر دەکەن، سەبارەت بە زانکۆکانیشمان هەوڵ هەیە، بەڵام وەك پێویست نییە و پێویست بوو زیاتر کار لەسەر شیعری کلاسیکی کوردیمان بکەن، چونکە ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیمان لایەنێکی پرشنگداری ئەدەبیاتی کوردییەو بە بێ کلاسیك شتێکی ئەو تۆ نامێنێتەوە.

**× زۆرێك لەو شیعرانەی کە ئێوە ساغتان کردووەتەوە لە ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیدا، ئەو شاعیرانەن کە بەیەك شێوە زار شیعریان نووسیووە، ئەی بۆچی نەچوونەتە سەر شاعیرانی کرمانجی ژوور و هەندێ لە زاراوەکانی تری کوردی کە دەیان شاعیریی گەورەی تێدایە؟**

- لە ڕاستیدا چ من چ باوکیشم، ئەوەی تا ئێستە کردوومانە لەسەر شاعیرانی کلاسیکی کوردی ئەو شاعیرانە بوون کە لە شێوە زارەکەی شارەزایمان هەبووە، ئەو شاعیرانەی تری ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی ئێمە هیچ جۆرە شارەزاییەکمان لە شێوە زارەکەی نەبووە، بەڵام ئەحمەدی جەزیری، ئەحمەدی خانی کە پێشەکی دیوانەکەیانم خوێندەوە تێگەیشتم پێشەکییەکی سیاسییە نەك ئەدەبی، بەڵام گرفتێکیشم نییە لە تێگەیشتن لێیان، بەڵام بۆ ساغکردنەوە ڕەنگە تۆزێك قورستر بێت، من بۆخۆم زۆر گرنگیم بە خانی داوەو پێم وایە خانی و حاجی قادر دوو شاعیری کلاسیکی کوردین کە دوو بیریاری گەورەی کورد بوون کە هزری کوردیان بلاوکردووەتەوە.

**× وەك دەزانین ئێستە تۆ لە ماڵەوەیت و لە ژوورەکەی خۆشتا بەردەوام خەریکی نووسینیت، دەکرێت بزانین ئێستا چ کتێبێکت بەدەستەوەیە وەك نووسین؟**

- ئێستا سەرقاڵی ساغ کردنەوەی (دیوانی سالم)م، کاتی خۆی چاپ بووەو چەندین چاپیش کراوەتەوە لە سنە و مەریوان و موکریان، ئەم دیوانە باوکم شەرحی کردووە، بەڵام ئێستا من جارێکی تر بەسەریدا دەچمەوە، بەڵام بۆ ئەم دیوانەی سالم پشتمان بەو چاپانەی ئێران نەبەستووە، پشتمان بە دوو نوسخە بەستووە یەکێکیان لە پاریس بووەو ئەوی تریشیان لە بەرلین، تەنانەت نوسخەکەی بەرلین نووسراوە حەسەب فەرمایشتی عەبدولرەحمان بەگی سالم نووسراوەتەوە، فەزڵی دەسکەوتنی ئەم دوو نووسخەیەی شیعری سالم بۆ د.مارف خەزنەدار دەگەڕێتەوە، وتارێکی لە (هیوا) بلاوکردەوە، ئەو کات من هیوام بەڕێوەدەبرد لە وتارەکەیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە دەیان دەستنووسی شاعیرانمان لە مۆزەخانەی ئیمپراتۆری بەرلین پارێزراوە، پێشتریش کەمال فواد نووسخەیەکی هێنابوو بۆ باوکم ئەویش بە دەستی خۆی ئەو دەستنووسەی نووسییەوە، چونکە ئەو کات ئیستنساخ و کۆپی و شتی وا

نەبوو، ئێستاش بۆخۆم ڕۆژانە بە پێی کات چەند سەعاتێك کاری تێدا دەکەم و پاکنووسی دەق و بەشەکانی دەکەم، ئەمە جگە لە شتی تریش بۆ نموونە چەند کەسێك پرسیاریان بۆ ناردووم بۆ دیمانە و دیدار، وردە وردە ڕۆژانە وەڵامیان دەدەمەوە، دوای ئەمەش من کەشکۆڵی مەحمود پاشای جافم ساغ کردووەتەوە، وەختی خۆی نووسیوومەتەوە لەسەر خەتی مەحمود پاشای جاف خۆی ساغم کردووەتەوە و فەرهەنگم بۆ کردووە و ئەوەش خەریکە ئامادەی دەکەم بۆ چاپ کردن، جگە لە مانەش کۆمەڵێك شیعری خۆمم هەیە بە تەمام کۆیان بکەمەوەو لە کتێبێکدا چاپیان بکەم، شیعرەکانیش هەمەجۆرن بۆ نموونە کاتی خۆی شیعرێکم نووسی بەناوی دوێنێ و ئەمڕۆ لە ڕۆژی کوردستان بڵاوکرایەوەو شەهید دڵشاد مەریوانی شتێکی جوانی لەسەر نووسی و زۆر وەسفی شیعرەکەی منی کرد، دواتر شیعرێکی ترم بۆ ناردن وتبووی وەڵا ئەمەیان هیچ نییە، ڕاستیشی کردبوو ئەو شیعرەم فاشیل بوو، ئەمانە هەموو ئەو شتانەن کە ڕۆژانە خەریکم پێیانەوە بۆ ئەوەی لەم قۆناغەدا بە ئەنجامیان بگەیەنم.

# کاکە حەمەی مەلا کەریم، شۆڕە سواری مەیدانی ئەدەب

مستەفا ساڵح کەریم

کاکە حەمە! داوای لێبوردن دەکەم، هەواڵەکان ناخۆشن، مارەسڕبووەکان سەریان دەرهێناوەتەوە، دەیانەوێت ئەو ڕەنجەی تۆو هەزارانی وەك تۆ کێشاتان بەبا بڕوات، گەرەکیانە لانەی ئازادیمان لێتێکبدەن، کەباسی هەڵەبجە شەهیدەکەی تۆیان بۆ دەکەین، وەك باسی حیکایەتێکی خورافی هەزارو یەك شەوەیان بۆ بکەین وایە، هیچ باکیان نییەو دەڵێی نەبایان دیوەو نەباران! کەباسی شارەکەی بابا گوڕ گوڕ و کرێکارانی گاورباخی هاوسەنگەری تۆیان بۆ دەکەین، کەدەڵێین ئەم شارە نموونەی برایەتی و پێکەوە ژیان بوو، ئەم زەردە مارانەی ئەمڕۆ گوێی خۆیان لەئاست ڕاستییەکان کەڕ دەکەن، ئەو دەمامکدارانە ئێستا ئەو فیدراڵییەی کەگەلەکەت بەخوێن بەدەستی هێناوە، ئەوان لایان پەشمە، چونکە چاویان بەئازادیی هەڵنایەو، لەدیموکراسی دەسڵەمنەوە، دوای تێپەڕبوونی پتر لەنیو سەدە بەسەر بەشداریکردنی ئازایانەی تۆو هاوڕێیانی تۆ لەو کاروانە پڕ سەروەرییەدا کە لە پێناو سەرفرازی گەلەکەتدا ماندوو بوویت، زیندانت بینی، ئەشکەنجە درای، برسێتی و نەداراییت بینی، وا جارێکی تر ئەو جانەوەرانە دەیانەوێ بەری ڕۆژ بە بێژنگ بگرن و بە پیلان و بە قسەی زلی پف هەڵدراو و هەڵگێڕانەوەی حەقیقەت خەباتی سەختی تۆو هاوبیرانی تۆ زیندە بە چاڵ بکەن، ئەو ناوچانەی لەجەرگی کوردستانیان لەتکرد پێیان قورسە بێتەوە سەر کوردستان. تەنانەت سووکایەتی بەو دەستوورەش دەکەن کەملیۆنان خەڵکی عێراق دەنگیان بۆداوەو بۆتە مەرجعێکی یاسایی.

کاکە حەمەی برام، ببورە ئەم هەفتەیە نەهاتم بۆ دیدەنیت و لە تەنیشت کورسییە گەڕۆکەکەتا دانەنیشتم، چونکە لە زەماوەندێکی ئەدەبیدا بووم هاوڕێیانی هەردووکمان بە شیعر و بەچیرۆك تەلاری ئەفسانەییان بنیات دەنا، بەدەم چێژ وەرگرتنم لەدەنگی پڕ جۆشی هونەرمەندانی لوڕو ئاوازە خۆشەکانیان، بیرم لەو ئەرکە گەورەیە دەکردەوە کەدەزگای (سەردەم) پێیان سپاردووم، ئاخۆ لەتوانامدا دەبێ ئەو هەموو ڕووناکییەی تۆ لە شەست ساڵی ڕابردوودا لە شاخ و دەشت و هەردی کوردستانا پەخشت کردووە، من بە موعجزەیەك باوەشیان بۆ بکەمەوە وخۆم بدەمە بەر تیشکیان تا لە سایەی پڕشنگەکانیانەوە بتوانم بێمە دەست و چەند خشتێك بخەمە سەر دیواری تەلاری گەورەیی ومەزنیی تۆ.

* لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا، سوار چاکێ لەهەورامانەوە بەبەرگی فەقێیەتی و بوخچەیەك کتێبی حوجرە و مەلایەتی و چەند پڕیاسکەیەك کتێبی مارکسییەوە بەرەو سلێمانی هات، لەپاڵ خوێندنی ئایینی دا بوو بە دۆستی گۆران و ئاشنای قەڵەم، مەردانە نەمامی ئاشتیخوازیی دەناشت و تۆوی خۆشەویستی دەچاند، تا بووە ئەستێرەیەکی درەوشاوە، ئەوسا بەئەموست ئاماژەیان بۆکردو وتیان: ئەوە کاکە حەمەی کوڕی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارەیە.. خەڵکی خۆشیان ویست و بەئاسانی چووە دڵەوە.

* شەوانە کە ئەو کتێبە قەدەغەکراوانەی دەخوێندەوە، خەونی بە کۆڵخوزو سۆفخۆزەوە، دەبینی ئاواتی بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان لە بیارە مەزرەعەی تەعاونی هەبێ و خەڵکەکە بەهەرەوەزی کار بکەن و ڕەنجی ماندوو بوونیشیان بۆ خۆیان بێ و خوێندنیش لەهەموو سوچێکی هەوراماناو بگرە لەهەموو کوردستانا پەرەی سەند بێ و نەبینێ مرۆڤ، مرۆڤ دەچەوسێنێتەوە.

کاکە حەمەی ئازیز..!

* ئەو سەردەمە نەتدەزانی دەبیتە مریدی نالی و سالم و کوردی و مەحوی و مەولەوی و خوێندکارێکی زیرەکی گۆرکی و چیخەف و تۆلستۆی، بەڵام باش ئەوەت دەزانی کە دەبیتە ئاشنای کەلەپچەو کۆت و زنجیر و ژووری ساردوسڕی زیندان، چونکە ئەو ڕێگایەی گرتبووتە بەر سامناك بوو، پڕ دڕك و خاربوو، بەگوڵ و ڕێحانە نەچێنرابوو، هەرواش بوو، جارەها ئاشنای گرتوخانەو زیندانەکانی باقوبەو نوگرە سەلمان وحیللە بوویت و، لەو شوێنانەشدا بوویتە هاوڕێی چەپکێك لەتێکۆشەرە ناودارەکانی عێراق، وتەکەی گۆرکیت لەبەرخۆتەوە دەوتەوە «بەندیخانە ئێزگەی حەوانەوەیە لەسەفەری ژیانا» ئیتر بەرەبەرە خەمەکانت زۆر بوون. خەمی گەلەکەت بۆ هێنانەدی خەونەکانی، خەمی ڕەخساندنی دەرفەتی ئازادیی بۆ ڕادەربڕین بێ سانسۆر، خەمی نەخۆشیی و هەژاریی و بێکاریی، کەمیللەتەکەت بەدەستیانەوە دەناڵێنێ.

* خەمێکی تریشت ئەوە بوو هەوڵبدەی وشەی ڕەسەنی جوان، هەتا دێت زیاتر بدرەوشێتەوە، بۆیە ڕێبازی ئەدەبییشت هاوتەریبی ڕێگای خەبات گرتەبەر.

تۆ لەسەر دەربەدەریش ڕاهاتیت، سەرەڕای ئەم زیندانە و ئەو زیندان، شوێنەکانیشت دەگۆڕان، بیارە، سلێمانی، کەرکوك، بەغدا، وەك لەبیرت بێ لەکاتێکدا تۆو کاکە فاتیحی برات لە زیندانا بوون عومەر عەلیش پاشای شار بوو، بەئەستێرەکانی

سەرشانیەوە دەرەقەتی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس هات و نەفی کرد بۆ کوێرە گوندێکی دەوری تۆزخورماتو، کە تاقە یەك فەقێی تێدانەبوو تا مامۆستا عەبدولکەریم دەرسی تیابڵێتەوە، لەکاتێکدا ئەو بەناوی دەرس وتنەوە بۆ ئەوێ دوورخرابووەوە، بۆیە ئەویش بڕیاری جۆرە یاخی بوونێکی داو گوندەکەی بەجێ هێشت و ڕووی کردە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکوك. بۆ تۆش کەرکوك وێزگەیەکی گرنگ بوو بۆ خەباتی ژێرزەمینیت و هەرلەوێش ئاشنای ڕۆژنامەی (ئازادیی) بوویت و ساڵانێکی دورودرێژ بوویتە عاشقێکی گەورەی ئەو ڕۆژنامەیە.

* کاکە حەمە بەدڵنیاییەوە دەڵێم، ئەگەر بەقەد باڵای درەختێکی گەورە، بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی کتێبت لەسەر بنووسرێ، دەربارەی خۆت، کەسایەتی باوك و بنەماڵەکەت، ڕیز بەندیی نووسین و بەرهەمەکانت، پێناسەت وەك مرۆڤ، تێکۆشەر، نووسەر، وەرگێڕ، (بەشیر وتەنی شاعیریش- عند الأیجاب) هێشتا ناتوانرێ بەتەواوی مافی کوڕە هەرزەکارەکەی بیارە بدرێ، کەهیچ خۆشییەکی لەژیانی لاویتی خۆیدا نەبینی، چونکە هەموو ژیانی پێشکەش بەو ڕێبازە کردبوو کە گرتبوویە بەرو هەر بۆئەوەشی تەرخان کردبوو .

** دەبێ ئەوەش بڵێم کە حەمەی برام (ئەمەیان زاراوەیەکە خۆی بەکاری دەهێنێ) هەگبەکەی هەمیشە پڕ بوو لە پارچە ڕۆژنامەو لە نامیلکە و کتێب. ڕێگای پۆستەخانەکانی بەغداش ئاشنای هەنگاوەکانی ئەو ڕێبوارە بووبوون کە ماندوێتی نەدەزانی، بەپەلە بوو بۆ ناردنی چاپەمەنییە کوردییەکان، بۆ نووسەرانمان لەهەندەران تا هەردەم ڕۆحیان ئاشنای کوردەوارییەکەی خۆمان بن و لەهەواڵی نەدەبیمان دوور نەبن و میزاجیان تێکنەچێ.

* بۆ منیش شانازییە بڵێم: ساڵانێکە هاوڕێ و دۆستی کاکە حەمەم، سەرەتا بەهۆی هاوڕێی هەردووکمانەوە خواڵێخۆشبوو محەمەد کەریم فەتحوڵلا کە لەبەغدا بە ئەبو سامان ناسرا بوو، لەسەردانێکما بۆ ڕۆژنامەی ئازادیی لەبەغدا پێکمانی ناساند، ئیتر لەوەو دوا لە یەکێتیی ئەدیبانی عێراق کە جەواهیری سەرۆکی بوو، پاشان لە یەکێتیی نووسەرانی کوردو لەچالاکییە ئەدەبیەکانا و لەڕۆژنامەی (التآخی)دا زیاتر دۆستایەتیمان گەشەی کردو بەردەوام بوو.

حەمەی مەلا کەریم — د. کەمال مراودەلی — مستەفا سالح کەریم — شێرکۆ بێکەس

* لەبیرمە ئەو ڕۆژەی لەفڕۆکەخانەی بەغدا، هاوڕێیەکانی بەڕێیان دەکرد بۆ مۆسکۆ بۆ خوێندن، کاك دارا تۆفیقی شەهید کەسەرنووسەری (التأخی)بوو، کاکە حەمەش وەك سکرتێری نووسین لەو ڕۆژنامەیەدا کاری دەکرد، پالتۆیەکی زۆر چاکی بەدەستەوەبوو دەرکەوت کە بەدیاریی بۆ کاکە حەمەیەو پێیی وت: مۆسکۆ ساردە، ئەمەت لەوێ پێویست دەبێ، کەلەفڕۆکەخانەش گەڕاینەوە، کاك فەلەکەدین کاکەیی وتارێکی لە(التأخی)دا نووسی تێیدا وتبووی: ئێستا ئەگەر کاکە حەمە ئەم هەلانەی چاپ لە (التأخی) دا ببینێ کەهەن، واز لەسەفەرەکەی دەهێنێ و دەگەڕێتەوە، دیارە ئەوە نیشانەی جددیەتی کاکە حەمەیە لەکارەکانیا، زۆریش مەبەستی بوو، وتارەکان بێ هەڵەی چاپ بن، کەهەڵەیەکی دەبینی زۆر بێزار دەبوو.

لەو ساڵانەدا کەپێکەوە بووین لەیەکێتیی نووسەرانی کوردا گەلێ وێژگەی پرشنگدار لەژیانی کاکە حەمەدا هەیە، کەپێویستیان بەباس کردن هەیە:

هەڵوێستی جوامێرانەی لەناو کۆنگرەی پێنجەما لەهەولێر، کەبەکۆنگرەی ڕووبەڕووبوونەوە، یان کۆنگرەی بەرگریی ناسرا.

هەروەها لەمیهرەجانی دووەمی شیعری کوردیی لەسلێمانی ساڵی (١٩٧٩)، هەر لەو ساڵەشدا بوو لەکۆبوونەوەیەکدا لەگەڵ خالید عەبد عوسمان کوبەیسی کەوەزیری تەنسیقی عێراقی بوو لەحوکمی زاتی، بەتوندیی ئێمەی مەحکوم کرد کەهیچ سۆزی عێراقێتیمان نەماوە، داوای کرد بچین گۆرانی بۆ ئێران بڵێین.

کاکە حەمە بەرپەرچی دایەوە وتی: ئێمە گۆرانی بۆ ولاتی خۆمان ئەڵێین، چونکە ئێمە لەپێناوی ئەم ولاتەدا قوربانیمان داوە بۆی تێکۆشاوین، ئیتر بۆ بەجێی بهێڵین و بچین بۆ ئێران گۆرانی بڵێین. جەنابی وەزیر گرژ بوو بەتوڕەییەوە وتی: تۆ کێیت؟ وتی: من مرۆڤم، بێگومان ئەوە مانای ئەوەش دەگەیەنێ کەمن مرۆڤم، بەلام تۆ ئاژەڵی. وەزیریش بەتوندی بەعەرەبی جنێوێکی سرەواندە کاکە حەمە.

* هەر لەهەمان ساڵدا لەسەر هەڵوێستە بەرودواکانی و لەسەر سووربوونی لەسەر نووسین لە ڕۆژنامەکانی حیزبی شیوعیدا ماوەیەکی باش لەئەمنی عامەش گیرا، لەوێ جارێك دانیشتنەکانی شەوانەی ئێمەی لەسلێمانی بیرکەوتبۆوە، لەبەرخۆیەوە گۆرانییەکی حەسیب قەرەداخی وتبوو کە زۆرجار پێمان دەوتەوە، لەسەر ئەوە کاکە حەمە نەختێ لێدانی خواردبوو، پێشیان وتبوو (هەم شیوعیشەو هەم گۆرانیش دەڵێ)، وەك شیوعی بۆی نەبێ گۆرانی بڵێ.

* هەر لێرەدا نهێنییەك هەیە کاتی ئەوە هاتووە بیدرکێنم، ئەویش ئەوەیە کە لەژێر ئەو ئیرهابە ڕەشەی بەعسداو لەو هەموو فشارەی خرابووە سەر پەیوەندیی نێوان کوردستانی ئازادو بەغدای ژێر حوکمی دەسەلاتی بەعسدا، ساڵانی دوای ڕاپەڕینی کوردستان، کاکە حەمە بەناوی (ڕۆژنامەنووسێکی خانەنشین) بەدەستێکی ئەمیندا وتارێکی بۆ ناردم تا لە (الاتحاد)دا بلاوی بکەینەوە، بەلام من بەلامەوە وابوو کە خانەنشینەکە سنووردارەو زوو خاوەنەکەی ئەدۆزرێتەوە، چونکە ڕۆژنامەنووسە کوردە خانەنشینەکان ژمارەیان کەمەو دیارن لەپەنجەی هەردوو دەست تێپەڕیان نەدەکرد، بۆیە لەبەر سەلامەتیی ئەوان گۆڕیم وکردم بە (ڕۆژنامەنووسێکی کوردستانیی)، ئیتر بەو ناوەوە لەو ڕۆژگارەدا کاکە حەمە بەرودوا وتاری باشی لە (الاتحاد)دا بلاو دەکرایەوە، بێگومان ئەوە (موجازەفەیەکی) گەورە بوو، کەم کەس لەو زەمەنەدا خۆی لەقەرەی دەدا.

لەکۆتاییدا، دەستخۆشی لە دەزگای سەردەم دەکەم، کە ویستیان ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤار) یش بچێتە پاڵ خەلاتەکەی دەزگای ئیبراهیم ئەحمەد و ڕێز لێنانەکەی بنکەی گەلاوێژ و بەسەرکردنەوەکەی حیزبی شیوعی، چونکە مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم، شیاوی ئەوانەیە و لەوانەش زیاتر. هیوای لەش ساغی و تەمەن درێژی بۆ ئەخوازم. لەگەڵ جەختکردن لەسەر وشەیەکی هاوڕێ عەزیز محەمەد لەدیمانەیەکی گۆڤاری (مامۆستای کورد)دا کە د.فەرهاد شاکەلی لەمۆسکۆ لەهەشتاکاندا لەگەڵیا کردبوو وتبووی: «هەموومان قەرزاری بنەماڵەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسین، خۆی وکوڕەکانی کتێبخانەی کوردییان دەوڵەمەند کردووەو دڵسۆزانە خزمەتی سامانی نەتەوەییان کردووە».

منیش دووبارەی دەکەمەوە کەخزمەتەکەیان لەبەرچاوەو ناویان لەلاپەڕە زێڕینەکانی مێژووی نوێی ئەدەبی کوردیمانا دەنەخشێنرێ و بەرهەمەکانیشیان هەردەم سەرچاوەی باوەڕپێکراون بۆ نووسەران و توێژەرەوانان. کاکە حەمەی مەلا کەریم- یش ئەدیبێکی تێکۆشەرو ئاشتیخوازو ڕۆڵەیەکی دڵسۆزی گەلەکەمانە.

مەکسیم گۆرکی

دوژمنان

"شانۆنامە"

گ. ڤ. پلیخانۆف

بەرەو سایکۆلۆژی بزووتنەوەی کرێکاران

لەبارەی (دوژمنان) ی (مەکسیم گۆرکی) یەوە

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

و

محەمەدی مەلاکەریم

کردوویانن بە کوردی

# لەبارەی دوژمنانی «مەکسیم گۆرکی»یەوە

**پلیخانۆڤ**

**و/ حەمەی مەلا کەریم**

پلیخانۆف ئەم وتارەی ساڵی ١٩٠٧ نووسیوە. یەکەمجار لە لاپەڕە ١- ١٧ی ژمارە «٥»ی ساڵی ١٩٠٧ی گۆڤاری «جیهانی ئەمڕۆ»دا بڵاوکراوەتەوە. پاشتریش ساڵی ١٩٠٨، لە بەرگی سێهەمی وتارە کۆکراوەکانی «لە ماوەی بیست ساڵدا»دا لەچاپ دراوە.
ئێمەش لە کتێبی «الفن والتصور المادی للتاریخ»ەوە کردوومانە بە کوردی کە کۆمەڵە وتارێکی پلیخانۆڤە، جۆرج تەرابیشی کردوویە بە عەرەبی و «دار الطلیعة»ی بێرووت بڵاوی کردووەتەوە.

(١) زۆرجار حوکمی سەلبیم لەبارەی هەردوو شانۆگەری «خۆرەزاکان» و «کێوییەکان»ەوە بەرگوێ کەوتووەو بیستوومە وتوویانە «بەهرەی گۆرکی هاتۆتە خوارەوە»، یا «نووسینە شانۆییەکانی ئەم دواییەی لە بارەی سەرنجی ئەدەبییەوە لاوازن و داواکانی ئەم چەرخە بەجێ ناگەیەنن». تەنانەت ئەوانەیش کە وایان دائەنا بیروباوەڕیان یەجگار زۆر لە بیروباوەڕی ئەم بنووسە پرۆلیتارییە مەزنەمانەوە نزیکە، هەر بەم جۆرە ئەدوان. ئێستا پاش ئەوەی «دوژمنان»م خوێندەوە، حەزئەکەم بزانم ئەوانەی کە قسە ئەهاتە سەر باسی «خۆرەزاکان»و «کێوییەکان» شانیان ئەلەقاند، سەبارەت بەم شانۆنامەیە چۆن بیرئەکەنەوە؟ تۆ بڵێی «دوژمنان»یشیان بەلاوە شانۆنامەیەکی لاواز بێ و مۆرکی ئەم سەردەمەی پێوە نەبێ؟ بەلام توخوا ئەی ئەوان کەسانێ نین ئەزانن ئەڵێن چی و نرخی هونەر ئەفامن!
من بەش بەحاڵی خۆم بێ هیچ پێچ و پەنایەك ئەڵێم ئەم شانۆنامەیەی گۆرکی شانۆنامەیەکی هەڵاویردەیە. کاکڵێکی بە پیت و زۆر دەوڵەمەندی هەیە. بنیادەم ئەبێ حەزی لێ بێ چاوی خۆی بنووقێنێ تا ئەمە بەدی نەکا.
بێ گومان، من کە «دوژمنان» م بەدڵە، لەبەرئەوە نییە کە ئەم شانۆنامەیە خەباتی چینایەتی چەپ و ڕاست لەو هەل و مەرجە تایبەتیانەدا ئەخاتەڕوو کە لە سایەی سەری ئەو لەخۆبووردنە ڕێ بە شەکەت بوون و وەڕزبوون بەخۆنەداوەی سەرکردایەتییەکی هۆشیارەوە، لای ئێمە ڕوونەدا: ورووژانێکی گشتی کرێکاران لە یەکێ لە کارخانەکاندا، کوژرانی یەکێ لە خاوەن کارخانەکان، دەست تێوەردانی سەربازو جەندرمە لە مەسەلەکە: ئەمە گشتی بێگومان مۆرکی دراماییەتی و «زیندوویی»ی پێوەیە. بەلام هەموو ئەم ڕەگەزانە تەنها ڕێ تێچوونی بەرهەمێکی شانۆیی باش ئەدەن بەدەستەوە. مەسەلەکە لەوەدایە ئاخۆ ئەم ڕێتێچوونە بووە بە ڕاست و هاتووەتەدی؟ وەلامی ئەم پرسیارەیش، وەك ئاشکرایە، بەندە بە ڕادەی هونەرییەتی ئەو شێوەیەوە کە چاری بابەتەکەی پێ ئەکرێ. هونەرمەند ڕۆژنامەنووس نییە. هونەرمەند حوکم بەسەر شتدا نادا، بەڵکو وێنەی شت ئەگرێ. ئەو هونەرمەندەی دێ خەباتی چینایەتیمان بۆ ئەخاتە بەرچاو، پێویستە لەسەری ئەو ئامادەبوونە دەروونییەیشمان بۆ دەربخا کە ئەم کێشەیە لە قارەمانانی شانۆنامەکەیدا دروستی ئەکا. ئەبێ ئەو چۆنیەتی یەمان پیشان بدا کە بیرو سۆزی قارەمانەکانی خۆیی پێ دیاری ئەکا. بە کورتی هونەرمەندی وا، پێویستە زانای سایکۆلۆژی بێ. هەڵاویردەیی ئەم شانۆنامە نوێیەی گۆرکی لەوەدایە کە لەم باری سەرنجەوە تەنانەت توندو تیژترین پێویستییەکانی بەجێ هێناوە. نرخی «دوژمنان» لەوەدایە کە ئەیخاتە سەر سایکۆلۆژیەتی کۆمەڵایەتی. من دەسەودامێنی ئەوانە ئەبم کە خۆیان بە سایکۆلۆژیەتی بزووتنەوەی ئێستای کرێکارانەوە خەریك ئەکەن، ئەم شانۆنامەیە بخوێننەوە.
خەبات بۆ ڕزگاربوونی پرۆلیتاریا بزووتنەوەیەکی جەماوەرییە. هەربۆیەیش سایکۆلۆژیی ئەم بزووتنەوەیە سایکۆلۆژییەکی جەماوەرییە. دیارە جەماوەریش لە کەسانی لێك جیا پێك دێ. ئەم کەسانەیش لەناو خۆیاندا وەك یەك نین. لە بزووتنەوەی جەماوەردا کەسانی لەڕو قەڵەو، کورت و باڵابەرز، ئەرژەنگ و قەترانی، ترسنۆك و ئازا، بێ هێزو بەهێز، نەرم و زبر بەشداری ئەکەن. بەلام ئەوکەسانەی جەماوەر پێکەوەیان ئەنێ و دروستیان ئەکات، گۆشتی گۆشتی جەماوەرن، ئێسکی ئێسکی جەماوەرن. هەڵوێستیان بەرابەر بە جەماوەر هەڵوێستی بەربەرەکانێ «معارضە» نییە، وەك ئەو قارەمانانەی لە کۆڕو کۆمەڵە بۆرژوایەکانەوە سەرهەڵئەدەن حەز ئەکەن وابکەن. ئەمان لەوە ئەگەن کە بەشێکن لە جەماوەر هەرگیز لێی جوێ نابنەوە. ئەمان هەرچەند زۆرتر بۆیان ڕوون ببێتەوە چ پێوەندێکی بنەڕەتی بە جەماوەرەوەیان ئەبەستێ، باشتر هەست ئەکەن کەوا لەناو ئاوو هەوای خۆیان و لە کۆشکی خۆیاندان.
کرێکار، بەر لە هەرچی، «گیاندارێکی کۆمەڵایەتی»یە، ئەگەر بمانەوێ لێرەدا، بە کەمێك جیاوازییەوە، تەعبیرە باوەکەی ئەرەستۆ بەکاربێنینەوە. ئەم ڕاستیە هەرگیز لەوانەنییە لەبەرچاوی کەسێ ون ببێ کە بیەوێ، با لە تەسکترین سنووریشدا بێ، خەڵك بداتە بەر سەرنج. ڤێرنەر سۆمبارت، کە لەوانەیش نییە خۆشویستانە باسی گیانی پرۆلیتاریایی بکا، ئەڵێ: «ئەو نرخەی کرێکار ئەیداتە پاڵ خۆی، ئەگەر لە خودی خۆیا تەماشای بکەین، هیچ مەعنایەکی نییە. بەلام کە تێکەڵی هیچی تر ئەبێ، واتای تەواوی خۆی وەرئەگرێ». تا لەمەوە دەرئەکەوێ بۆرژوای وا زۆرن کە ئەچنەوە سەر تاقمی «مرۆی مەزن»و لە دڵی خۆیانا حەزئەکەن لەوەوە بگەنە ئەو ئەنجامە کە ئەو نرخەی کرێکار ئەیداتە پاڵ خۆی، لە خودی خۆیا شتێکی هیچ و پووچەو هەرگیز ڕێی تێناچێ شەخسیەتێکی بەهێز لە کۆڕی کرێکاراندا پەیدابێ.

بەلام ئەمە هەڵەیەکی ناڵەبارە لە ئەستۆی ئاسۆ تەسکیی بۆرژوادا. گەشەکردنی شەخسیەت، لەو ڕووەوە کە سروشتە، ڕاستەوخۆ شان بەشانی گەشەکردنی هەستی سەربەخۆیی لە کەسەکەدا ئەڕوا، واتە شان بەشانی توانای لەسەر قاچی خۆ پتەو وەستانی ئەو کەسە ئەڕوا. ئەم توانایەی کریکاریش، هەروەك ڤیرنەر سۆمبارت خۆی دانی پیا ئەنێ، کریکار خۆی پەیدای ئەکاو بەڵگەیش بەدەستەوەیە کەوا گەلێ پێش بۆرژوا پەیدای ئەکات. کریکار گوزەرانی خۆی بە ڕەنجی شانی خۆی پەیدا ئەکات، هەموویشمان ئەزانین ئەم ڕەنجی شانە چەند سەخت و چەند ناڕەحەتە. هەر لە سەرەتای تەمەنیشەوە دەست ئەکات بەم گوزەران پەیداکردنە بۆ خۆی، لەکاتێکا کە منداڵی خێزانە «خواپێداوەکان» هێشتا لە هەموو ڕوویەکی ژیانیانەوە بارن بەسەر شانی خەڵکەوە. بەلام ئەگەر وابێ ئەو نرخەی کریکار ئەیداتە پاڵ خۆی، هیچ مەعنایەکی نەبێ مادەم لەگەڵ هیی کەسانی تر تێکەڵ نەبووبێ، ئەوە لەبەر دوو هۆیە. یەکەم ڕێکخستنی تەکنیکی هێنانەبەرهەمی هاوچەرخ و، دووهەمیش ڕێکخستنی کۆمەلایەتیی هێنانەبەرهەمی هاوچەرخ، یا مارکس واتەنی، لەبەر مەرجە تایبەتییەکانی هێنانە بەرهەمی کۆمەڵگەی سەرمایەدارییە. کریکار هۆیەکانی هێنانە بەرهەم شك ناباو بە فرۆشتنی هێزی کارکردنی خۆی نەبێ ناژی. کریکار بە حوکمی ئەوە کە فرۆشیاری هێزی کارکردنە، واتە بە حوکمی ئەوە کە فرۆشیاریکە لە خۆی بەولاوە کەل و پەلێك شك نابا لە بازاڕا بیفرۆشێ، ئەگەر وەك تاقەکەس تەماشای بکەین، شتێکی هیچ لێ نەهاتووە دەسەلاتی بەسەر هیچا ناشکێ. کەواتە کاری هەموو بەدەست ئەوانەیە کە هێزی کارکردنەکەی ئەکڕن و هۆیەکانی هێنانە بەرهەمیان بەدەستەوەیە. کریکار چەند زووتر بتوانێ لەسەر پێی خۆی بوەستێ، ئەوەندە زووتر هەست بەم شوێن کەوتوویەی خۆی لەناست ئەوانەدا ئەکات کە هۆیەکانی هێنانەبەرهەمیان بەدەستەوەیە، واتە ئەوەندە زووتر سەربەخۆیەتیی خۆی وەدەست ئەهێنێ. بەم چەشنە خۆیەتیی کریکار، ئەوەی تیا ئەخولقێنێ کە هەست بە شوێن کەوتوویی خۆی بکاو، ئارەزووی ئەوەی تیا پەیدا ئەکا کە ئەم ئێڵەی شوێن کەوتوویە لە گەردنی خۆی دامالێ، یا هەر هیچ نەبێ باری سووك بکات. بۆ گەیشتن بەم ڕزگارییە، لە ڕێگای بەیەکاچوون لەگەڵ کریکارەکانی تر بەولاوە، ڕێگایەك نییە. لەڕێگای یەکگرتن لەگەڵیان زیاتر لە خەباتی پێکەوەی هەمووانداا لەپێناوی مانەوەدا- ڕێگایەکی تر نیە. بۆیە کریکار تا لەشوێن کەوتوویی خۆی بۆ سەرمایەدار پتر بێزار بێ، زیاتر هەست بەوە ئەکا کە ئەبێ لەگەڵ ڕەنجکێشەکانی تر لە یەك بئاڵێن و، پێویستە هاوکاری لەگەڵ کریکارانی تر بکاو، ئەبێ جەماوەر بە بیری یەکگرتن هوشیارکاتەوە. ئارەزووی کریکار بۆ چوونە ناو جەماوەر، ڕاستەوخۆ شان بەشانی هەوڵیەتی بۆ ڕزگاربوونی خۆی. بەکورتی ئەو ئارەزووی شان بەشانی گەشەکردنی شەخسیەتی خۆی ئەڕوا. دیاریشە ڤیرنەر سۆمبارت دەرکی بەمە نەکردووە.

ئەگەر لەبارەی سەرنجی ئەو مەرجە کۆمەلایەتیانەوە تەماشا بکەین کە ئەمرۆ بەرهەمیان تیا ئەهێنرێتە بەرهەم، هەموو شتێ بەم جۆرە دیاری ئەدا. کە بەپێی باری سەرنجی تەکنیکی ئەمرۆی هێنانە بەرهەمیش تەماشا بکەین، ئەنجاممان بەم جۆرە دەسگیر ئەبێ: کریکاری زەحمەتکێش کە لە دەزگایەکی سەرمایەداریدا کار ئەکات، بەرهەمێکی تەواوی ئامادە پێشکەش ناکات.

بەڵکو تەنها بەشێکی بەرهەمەکە پێشکەش ئەکا. بەرهەمە بەتەواوی ئامادەکە خۆی لەخۆیدا بەرهەمی هەوڵ و ڕەنجی لێك ئالاوو ڕێکوپێکی ژمارەیەکی زۆرو جاروباریش ئێجگار زۆرە لە بەرهەم هێنەکان. بەم چەشنە تەکنیکی هاوچەرخیش، بەش بەحاڵی خۆی، ئەکێشێتەوە بۆ ئەوە کە کریکار نرخێك بداتە پاڵ خۆی کە ئەگەر لەگەڵ نرخی ئەوانی کە لێك نەدرێ، واتای تەواوی خۆی نابەخشێ. بەکورتی تەکنیکیش، بەش بەحاڵی خۆی، بەشدارە لە کردنی کریکاردا بە «گیانداریکی کۆمەلایەتی» بەر لە هەر شتێکی کە.

ئەم دوو بارودۆخە، بەو کارە بن بڕکەرەی ئەیکەنە سایکۆلۆژیی پرۆلیتارییایی، هەر بەهۆی ئەم سایکۆلۆژییەوە، کاریش ئەکەنە تەکتیکی پرۆلیتاریا لەخەباتیا لەدژی بۆرژوا. بزوتنەوەی پرۆلیتاریا بزووتنەوەیەکی جەماوەرییەو خەباتیشی خەباتێکی جەماوەری یە. هەرچەندیش هەوڵ و تەقەلای ئەو تاقە کەسانەی جەماوەریان لێ پێك دێ، لەیەك بئاڵێ و بەتین تر یەك بگرێ، سەرکەوتن نزیکە دەستتر ئەبێ.

کریکار بە تاقی کردنەوەی خۆی و هەر لە لاوییەوە ئەمە ئەزانێ. هەر ئەمەیشە یەکێ لە قارەمانەکانی گۆرکی، یاگۆدینی کریکار، بە ساکارییەك دەری ئەبڕێ کە ئەڵێ: با یەك بگرین.. با لەدەوری یەك خڕببینەوە.. وابکەین، هەموو شتێ حازرو بازر ئەبێ».

ڕاستە وایە مەسەلەکە، بەڕاستی «حازرو بازر» ئەبێ، هەرچەندە- ئەمەیش هەروا ڕاستە- وا زوو نابێ کە لە قسەکانی یاگۆدینەوە دەرئەکەوێ، بەلام ئەوەی لێ وەرئەگیرێ کە پێویستی بە تین تر کردنی پێوەندی نێوان کریکاران بۆئەوەی سەرەنجام مەسەلەکە «حازرو بازر» بێ، هەر زیاتر ئەبێ.

چالاکیی نوێنەرانی چینی کریکار کە ئەرکی سەرکردەیی کردنییان لەئەستۆدایە، بەشێوەیەکی سروشت کردو نیمچە غەریزەیی بەرەو ئەم یەکگرتنە، بەرەو ئەم ڕێکوپێکییەی هێزە

پرۆلیتاریاییەکان ئەڕوا. دیارە بەلای ئەم نوێنەرانەوە یەکێتی و ڕێکوپێکی بەتین ترین و بەسوودترین و بە پیتترین هۆیەکی تاکتیکین لە خەباتدا بۆ دوارۆژێکی چاکتر.
هەرچی هۆی ترە، هەموویان بەلاوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەم هۆ تواناو بەپیتە، ناسەرەکی و پلە دووە. بەڵکو هەندێکیشیانیان هەر بەجارێ بەلاوە بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی مەبەستیانە، بێ کەلکە، هەرچەند جاروباریش لەبارودۆخێکی کۆمەڵایەتیی تردا تا ئەندازەیەك سەرکەوتن لە بەکارهێنانیاندا دەسگیر ببێ.
لەم شانۆنامە تازەیەی گۆرکیدا لێڤشینی کرێکار پاش ئەوەی میخائیل سکرۆبۆتۆڤی دڵ ڕەق، کە یەکێك بوو لە دوو خاوەنەکەی کارگەکە، بەدەستی ئەکیمۆڤی هاوڕێی «هاوڕێی لێڤشین» ئەکوژرێ، ئەم سەرنجە پیشان ئەدا: « بەداخەوە ئەندرێی پەنجەی بە دەمانچەکەیا نا.. ئاخر بە کوشتن چی دێتە ئەنجام؟ هیچ دەسگیر نابێ.. سەگێك ئەکوژی، خاوەنەکەی یەکێکی تر ئەکڕێ. هەموو ناوەڕۆکی مەسەلەکە ئەمەیە».
ئەمەی کە پێی ئەڵێن تیرۆر، ڕێگای خەباتی پرۆلیتاریاییانە نیە. تیرۆریستی ڕاستەقینە، لە سروشت و ڕەوشتی خۆیەوە بێ یا بەهۆی» بارودۆخێکی سەربەخۆ«وە بێ، کابرایەکی فەردییە.
«شیلەر» بە بلیمەتی و زیرەکیی خۆی باش لەمە گەیشتووە.
«ویلهێلم تێل»ی قارەمانی کابرایەکی پڕ بەپێستی وشەی فەردییەتی فەردییە. کاتێ کە «شتاو فاخێر» پێی ئەڵێ: «ئێمە ئەگەر یەك بین، ئەتوانین گەلێ کاری مەزن ڕاپەڕێنین»، ئەم بەم جۆرە وەڵامی ئەداتەوە: «کە پاپۆڕ ئەکەوێتە گێژاوەوە، ئەوە ئاسانترە مرۆ بەتەنیا خۆی ڕزگار کا». کە هەر ئەم شتاو فاخێرەیش سەرزەنشتی ئەکا کەوا بەساردییەوە ڕوو لە کاروباری قازانجی گشتی وەرئەگێڕێ، ویلهێلم تێل وای وەڵام ئەداتەوە کە کەس پێی ناکرێ بەڕاستی و متمانەوە پشت بە لەخۆی بەولاوە ببەستێ. ئەم دوو باری سەرنجە لە ڕیشەوە دژی یەکن و لێك جیاوازن. شتاو فاخێر یەك لە پاش یەك بەڵگە دێنێتەوە کەوا «بێ هێزان بە یەکێتی هێز پەیدائەکەن». ویلهێلم تێلیش دەس ئەکا بە ملەجڕێ و ئەڵێ «پیاوی بێ هێز کاتێ لە چلەپۆپەی بەهێزیدا ئەبێ کە بەتەنها خۆی بجووڵێتەوە». ویلهێلم تێل تادوایی بۆ ئەم پێڕەوەی خۆی بە وەفاداری ئەمێنێتەوە. ئەوەتە «بەتەنها» خۆیشی مەسەلەکە لەگەڵ جیسلەر ئەبڕێتەوە. هەرچی شتاو فاخێریشە، ئەوە، بەپێچەوانەی تێلەوە، شیلەر وای پیشان ئەدا کە نموونەی مرۆی بانگ ڕاهێڵ و ڕێکخەرو پێشەوای بزووتنەوەی جەماوەرە.
ئەم پیاوە بەهێزو بەورەیەیش، هەروەك ویلهێلم تێل، لە ڕووی سەرچڵترین لەمپەرا ناگەڕێتەوە دواوە. ئەوەتە لە کۆڕی «گریۆتلی»دا وتەیەکی بەشکۆ ئەدا تیا ئەڵێ: «تەنانەت توانای زۆردارەکانیش سنوورێکی هەیە. چەوساوەیش کە ئەبینێ لە هیچ لایەك مافی خۆی دەسگیر نابێتەوە، ئاڵای مافە نەمرەکانی خۆی هەڵئەکا کە بەکەس پێ شێل ناکرێن و، شیری خۆی لە کالان دەرئەکێشێ». باشترین دابین کەری سەرکەوتنیش لە یەکگرتنا بەدی ئەکا. بۆیە پێویستە هەموو ناوچەیەك لە ناوچەکانی دارستانەکان لە خەباتی ئازادی بەخشدا بەشداربن و هەموو بەپێی ڕێکەوتنێکی تێکڕایی، پێکەوە کاربکەن:
که دەنگی بانگەواز لە نووری یەوە دێ و،
کە ئونتێر ڤاڵدین بۆ یارمەتیدان ڕائەپەڕێ،
ئەوسا شڤێنزیش لەگەڵ هاوسوێنی کۆنی خۆی دەس پیسی ناکا.

بەم ڕەنگە نەبێ دەس دانە خەبات هیچ سوودێك نابەخشێ. شتاوفاخێر تەنانەت مەترسیی ئەوەیشی لەدڵایە کە دەس پێشخەری کەریی ئەم و ئەو ببێ بە مایەی لەدەسچوونی هەلەکانی سەرکەوتنی مەسەلە هاوبەشییەکەی هەمووان. ئەو بە پێ لێ داگرتنەوە ئامۆژگاریی ئەوانە ئەکا کە لە کۆڕەکەی گریۆتلیدا خڕبوونەوەو ئەڵێ:
ئێستا با هەرکەس بچێ بەڕێی خۆیەوە
با هەرکەس خەریکی ئیش و کاری خۆی بێ و
بێ دەنگ، ئەندامی نوێ
بۆ پەیمانەکەمان پەیدا بکا..
ئەو بارە هەڵگرن کە پێویستە هەڵیگرن
تا سەردەمێ.. تا کاتێ..
با جەورو ستەم هەر زیاد بکا تا ئەوڕادەیەی
سەرەنجام..
تاد.
ئەمە لێکدانەوەیەکە واتـای خۆی بە ڕۆشتنی ئەبەخشێ. ئەوەتە کە تێل جیسلەر ئەکوژێ، بە کوشتنی ئەو خزمەتێکی گەورەی سەرانسەری سویسرا ئەکا، بەڵام توانای بەسەر ئەوەدا ناشکێ بزانێ چۆن لە کاتێکی دیاریدا، بزووتنەوەی ئازادی بەخش پەیدابوو هاتە دنیاوە، بەڵکو تەنانەت کە ئەم ستەمکارە نەفرەت لێ کراوەیش ئەکوژێ، وای لا چاکە هەر «بەتەنها» خۆی هەڵسووڕێ. کارەکەیشی تۆڵەسەندنەوەیەکی شەخسی بوو. وەختی خۆی «لاسال»یش سەرنجی بۆ ئەو پاڵ پێوەنەرە شەخسییە ڕاکێشاوە کە بووە بە هۆی ئەم کردارە پیاوانەیە، بەڵام هەرچی شتاوفاخێرە، ئەوە بەپێچەوانەی ویلهێلم تێلەوە ئەڵێ:
ئەوەی مافی خۆی بەدەستی خۆی ئەسێنێ.
ماڵی گشتی ئەدزێ
«ماڵی گشتی ئـەدزێ» چونکە سوودی گشتی وا پێویست ئەکا کە بۆ گەیشتن بە ئامانج، هەموو لایەك بەگوێرەی

ڕێککەوتنێکی تێکڕایی کاربکەن. شتاوفاخێر بەتەواوی ڕاست ئەکا، چونکە کاری تاکە کەسی چاری هیچ شتێك ناکا لە مێژوودا. شیلەریش هەروەها پەنجە بۆ ئەمە ڕائەکێشێ. کارە گەورەکەی ویلهێلم تێل بەلای شیلەرەوە لەوە زیاتر سوود نابەخشێ کە ئەبێ بە دەسەچیلەی هەلگیرساندنی ئەو شۆڕشەی لەوەپاش سویسرای لە نیلەی نەمسا پێ ئازاد ئەبێ. هەلسووڕانی کەسانی وەك شتاوفاخێرە کە سەرجەمی بۆ پڕۆپاگاندەو ڕێکوپێك کردنی خەلك تەرخان کراوە، پێویستەکانی شۆڕشەکە فەراهەم ئەکا. هەرچی توانای ئەو پیاوە بەهێزانەیشە کە تا بە «تەنها خۆیان» کار نەکەن لە پڕەی کاریگەریی خۆیان ناگەن، ئەوە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ نەبێ ناچێتە ڕیزی ئەو پاڵ پێوەنەرانەوە کە ڕەوتی مێژوو دیاری ئەکەن.

ویلهێلم تێلی قارەمانی شیلەر لە سروشتی خۆیا کابرایەکی فەردی یە. بەلام وەك لەپێشەوە سەرنجمان دا کەسانی فەردیی وا هەن لە ئەنجامی «هەندێ بارودۆخی سەربەخۆ»وە بوون بە فەردی و، ئێمە ناچارین دان بەوەدا بنێین کە زۆر لە تیرۆریستەکانی کۆتایی سالانی حەفتاو سەرەتای سالانی هەشتای ئێمە، لەم جۆرە بوون.

ئەو پەڕی مرازی ئەمانە ئەوە بوو دەست لەناو دەست لەگەل گەلدا کاربکەن، بەلکو ویستیشیان وابکەن، بەلام زۆربەی گەل لە شوێنی خۆی نەبزووت و وەلامی بانگەوازی ئەمانی نەدایەوە، یان ڕاستر ئەمان نەیانتوانی خۆیان بگرن و چاوەڕوانی بکەن تا گەل وەلامی بانگەوازەکەیان ئەداتەوە. بۆیە ناچار «بەتەنها خۆیان چوونە پێشەوە». ئەمانە کەسانێکی بەهێزو بەزات بوون، بەلام ئەو وزەیەی ئەم پیاوە بەهێزو بەزاتانە لە کارە تیرۆریستیەکانیانا دەریان بڕی، تا ڕادەیەکی زۆر وزەی نائومێدی بوو، بۆیە دوژمن بەسەریانا زال بوو و بەزاندنی.

ئەو پڕۆلیتاریاییە هوشیارانەیش کە لە شانۆنامە تازەکەی گۆرکیدا دەرئەکەون، هەروەها مرۆی بەهێزن، بەلام ئەمان خۆش بەختانە هیچ بیانوویەکیان نییە بۆ ئەوەی لەو دەنگ دانەوەیە دوودڵ بن کەوا لەناو کۆمەلانی ڕەنجکێشاندا ڕایئەچەنێنن، بەلکو دەق بە پێچەوانەوەی ئەوەوە کۆمەلانی ڕەنجکێشان ڕۆژ بەڕۆژ بە دەنگی زولالتر وەلامی بانگەوازەکەیان ئەدەنەوە.

لێڤشین ئەلێ:

«گەل خەریکە بە ورياییەوە ڕاست ئەبێتەوە، گوێ ئەگرێ، ئەخوێنێتەوە، بیرئەکاتەوە».

کەس هەیە بەتەمای لەمە باشتر بێ؟ ڕاستەکەی لە چەرخێکی وەك ئەم چەرخەی ئێمەدا، بێ گومان، تەنانەت «ڕۆشنبیر»ە نەسرەوتووەکانیش ناتوانن لە دەرەوەی چوارچێوەی جەماوەردا کاربکەن.

ئەم قسەیە بەتایبەتی لەو کرێکارانەدا دیتەدی کە بە شان و قۆڵ کارئەکەن و گەشەیەکی ئۆرگانییان لەگەل جەماوەردا کردووە.

بەلام چەرخ هەر چەرخێ بێ، گومانی تیانییە کەوا «ڕۆشنبیر» ئامادەترە بۆ پشتبەستن بەوودەورەی کەوا «شەخسیەت» ئەیگێڕێ. هەرچی کرێکاری هوشیاریشە، ئەوە هەر بە غەریزەی خۆی متمانە بە جەماوەر ئەکا. بۆیە لێرەدا دوو تاکتیك هەیەو «دوژمنان»ی مەکسیم گۆرکی کەرەستەیەکی زۆرمان بۆ تێگەیشتنی ڕاستی بنەڕەتە سایکۆلۆژییەکانی تاکتیکی کرێکاران ئەداتێ.

حسێن جاف

(٢) من نیازم نییە هەموو ئەو کەرەستانە شی بکەمەوە، بەلام پێشم ناکرێ تەنها بەوە دەست بەردار ببم کە تا ئێستا وتراوە. کەواتە وا خەریك ئەبم.

ئاشکرایە کەوا پێشان و ئێستایش گەلێ کەس لای ئێمە تیرۆریزمیان بە باشترین ڕێگایەکی خەباتی قارەمانانە داناوە. ویلهێلم تێلی قارەمانی شیلەر پیشانی ئەدا کەوا ئەمە هەلەیە. ئاخۆ ویلهێلم تێل قارەمانەتییەکی گەورەتر لەوەی شتاوفاخێری

پیشانداوە؟ بە هیچ کلۆجێ نە.. هیچ زەحمەتیش نییە ئەگەر بمانەوێ ئیسپاتی کەین کەوا ئەگەر ویلهێلم تێل بێ سەروبەریی زۆرتر لا بووبێ، شتاوفاخێریش لەخۆبووردنی هوشیارانەی بۆ قازانجی گشتی زۆرتر لابووە. بۆ پێ سەلماندنی ئەمەیش هەر ئەوە بەسە کە قسە مەردانەکانی شتاوفاخێر لەبارەی «دزینی ماڵی گشتی»یەوە بێنینەوە یاد کە پێشان گێڕامانەوە.

**ئەم وتارە بەشێکە لەپێشەکی کتێبی شانۆگەری دوژمنـــان کە د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف لەڕووسییەوە کروویەتی بەکوردی و کاکە حەمە پێشەکیی بۆ وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی**

کاك محەمەدی مەلا کەریم، یەکێکە لە نووسەرە دیارو بەرچاوەکانی میللەتەکەمان و ڕۆڵێکی کاراو سەنگینی هەیە لەبوارەکانی ئەدەب و ڕۆژنامەنووسی و ڕووناکبیریی کوردیدا، دەشێت مرۆڤ لەگەڵێك بواری جیاجیای چالاکیەکانیدا قەڵەم تاوداو زانیاری بدات بەدەستەوە. چونکە کاکە حەمە ڕووناکبیرییەکی بەربڵاوی هەیە لە مەیدانی لێکۆڵینەوەو ڕۆژنامەنووسی و وەرگێران و وتاری جۆربەجۆری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و زمانناسیداو جێ پەنجەو مۆرکی بە ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردییەوە دیارەو نکۆڵی لێ ناکرێت.
سەرچاوەکانی بیرو هوشیاری کاکە حەمە فرەن، ئەو جۆگەلانەی کە دەڕژێنە ڕووباری زانیارییەکانیەوە چون یەك نین، هەندێکیان خوڕو تیژڕەو و هەندێکی تریش مەنگ و قووڵ و هەندێکی تریش سست و کەم خایەنن.
هەنگاوە سەرەتاییەکانی بیری کاکە حەمە، لە بەندەکانی بیروباوەڕی ئیسلامەوە دەستپێدەکات، بە حوکمی ئەوەی خودی خۆی مەلازادەیە و لەفەزای ئەو کتێب و سەرچاوە ئیسلامیانەدا هەناسەی داوەو گوڕو تینی دەسەلاتە بیری و فەلسەفیەکەی لەویوە سەرچاوەی گرتووە، نەك هەر ئەمە، بەڵکو زۆربەی زانستەکانی نحو، صرف، بلاغە، فیقە، عیلمی کەلام..... هتد، وەك ڕێبازو مەنهەج لە حوجرەکانی مزگەوتدا وەرگرتووە بە ئەزمکردنیەوە.
دیارە ئەم سەرچاوە ئاینییانە لە داهاتووی تەمەنی نووسینیدا یارمەتی فرەیداوە بۆ تاوتوێ کردن و لێکدانەوەی نەك شیعری کلاسیکی کوردی لە مەڕ نالی و سالم و مەحوی بەتەنیا، بەڵکو وەك لۆژیکی مامەڵەکردن لەگەڵ دەقە ئەدەبیەکانداو تەنانەت یارمەتی فرەیشی داوە لەکێشمەکێشە ئەدەبیی و ڕووناکبیرییەکانیشدا. بەشێك لەو کولتوورە ئاینییە کە زمانی عەرەبیە یارمەتی خۆڕۆشنبیرکردن و وەرگێرانە کانیشی داوەو سوودی فرەی لێبینیوە، چونکە بەشێکی گەورە لە ڕووناکبیریەکەی لەزمانی عەرەبییەوە وەرگرتووە.
د. عیزەدین موستەفا ڕەسوڵ دەڵێت، لەکۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکاندا، کاکە حەمە بەپەرۆشەوە داوای لێکردووم کە ئەدەبیات و بابەتە فیکری و هۆشیاریەکانی ئیخوانولموسلمینی بۆ پەیدابکەم لەگەڵ کتێبەکانی سەید قوتبدا، نەك هەر ئەمە، بەڵکو لەو سەردەمانەدا بیرو هەڵس و کەوتی ئیخوانی بەلاوە پەسەند بووەو پێشی سەرسام بووە.
لەدوای ئەم قۆناغەوە هێدی هێدی گۆڕانکاریەکی جۆریی لەبیری کاکە حەمەدا ڕوویداوەو فەلسەفەو ڕووناکبیریی چەپ و مارکسیەت بوونەتە، جۆگەلەیەکی خوڕو ڕژاوونەتە نێو ڕووباری بیرو لێکدانەوەکانیەوەو لەبەرهەم و هەڵس و کەوتە سیاسی و کۆمەڵایەتیو ڕووناکبیریەکانیا ڕەنگی داوەتەوەو بۆتە سەربازێکی دیارو زرنگ بۆ بەرگری لەم بیرە چەپ و پێشکەوتنخوازە، دەتوانم بڵێم ئاسەواری بەند بەندی ئەم بیرە بەسەر ژیانی سیاسیی و ئەدەبیی و ڕوناکبیریی و ڕۆژنامەنووسیی کاکەحەمەدا بەزەقی ئەدرەوشێتەوە، هەیمەنەی قەڵەم و هەڵوێستی کاکە حەمە لەبواری بەرگری لەبیری چەپداو لەنێوەندی ڕوناکبیری کوردیدا، لەئاستێکی زەق و نکۆڵی لێنەکراوبووەو بیری مارکسی پێخۆری سەر سفرەو خوانی زۆربەی بواری ڕۆژنامەنووسی و ڕووناکبیریەکانی بووەو بەشێکی بەرچاو لەخوێندنەوەو سەرچاوە ڕووناکبیریەکانی سەر بەو ڕێبازە بووە، نازم حیکمەت و گۆران و غورکی و قانیع و گەلێکی تری بیروباوەڕ چەپ، هەمیشە زاخاوی هەست و چێژە ئەدەبیەکەیان داوەتەوەو دەوڵەمەندیان کردووە، دەبێت ئەوەشمان لەبەرچاو بێت کە خودی کاکە حەمە ئەندامێکی چالاکی حیزبی شیوعی عێراق بووەو بەبیرو جەستە کاری تیاکردووەو وەك فێرکارێکی ئەو قوتابخانەیە لەڕۆژنامەی ئازادی زمانحاڵی ئەو حیزبە هاوبەشییەکی کارای کردووە، دیارە لەڕێگای ڕێکخراوەکانی ئەم حیزبەوە تێکەڵاوییەکی هوشیاریی و فیکریی و ئەدەبیی لەگەڵ دەست بژێری«نخبە» ڕووناکبیرە گەورەو ناسراوەکانی عێراقدا کردووەو ئەم فەزا سیاسی و ڕۆشنبیریە بۆتە جۆگەلەیەکی خوڕو ڕژاوەتە سەر ڕووباری مەرجەعیاتی تواناسازی ئەدەبی و ڕوناکبیری کاکەحەمەوەو بەخەستی لەبەرهەمە فرە مەوداکانیا ڕەنگی داوەتەوە، بەتایبەتی لەبواری ڕۆژنامەگەری و فیکریدا، تەنانەت قەڵەمە بە بڕشتەکەی بەرگریی کەرێکی بەتوانا بووە بۆ هەر قەڵەمێکی کوردی کە دژی ئەو ڕێبازە بوویێت.
لایەنێکی تری مەرجەعیاتی تواناسازی کاکەحەمە زمانی فارسیە، دیارە لەڕێی ئەم زمانەوە چاوی خشاندووە بە ئەدەب و ڕووناکبیریی فارسیداو کەم تا زۆر دەمەزەردی چێژی ئەدەبی پێ کردۆتەوەو لەو ڕێگایەشەوە فارسیەکەی بەهێزو

گوڕو تینی بووە، نابێت ئەوەمان لەبیربچێت کە لەچلەکاندا لە مزگەوت و حوجرەکاندا زمانی فارسی لەپەنای عەرەبیدا بەخوێندکار وتراوەو ئەزبەری کردووە، گوڵستان و بوستانی سەعدی شیرازی و ناگەهان و گەلێ کتێبی تر خوێندکار دەوری کردۆتەوەو تەنانەت ئەزبەریشی کردووە. نکۆڵی ناکرێت کە کاك محەمەد لەڕێگای زمانی فارسییەوە توانیوێتی زیاتر پەی بە ئەدەبی کلاسیکی کوردی ببات و شرۆڤەی لایەنە شاراوەکانی بکات، چونکە شیعرەکانی نالی و سالم و کوردی و مەحوی پڕن لە موفرەدات و دەستەواژەی زمانی فارسی، چونکە ئەم زمانە سەرچاوەیەکی پڕ بایەخ و داهێنانی شوعەرای کوردی ئەوسەردەمە بووەو تەنانەت گەلێ جاران هەر زمانی نامەو شیعرو نووسینیش بووە لەکوردستاندا، بەتایبەتی لەدەورانی حوکمی میرنشینی باباندا، تەنانەت شێخ ڕەزاو نالی و سالم و مەحوی بەم زمانە شیعری فارسی بەهێزو نەوازەیان نوسیووە.

نالی و سالم و مەحوی و کوردی کەم تا زۆر کاریگەری سەبکی هیندی و عیراقی و بازگەشت لەسەر شیعرەکانیان بەزەقی دیاربووە. بەحوکمی ئەوەی کە ماڵی کاکە حەمە لەدەورانێکدا لە بیارە بووەو زمانی ئاخاوتنی ئەوێشی شێوەزاری گۆرانیەو ئەوی کات خانەقاو مەدرەسەی بیارە جمەی دەهات لە فەقێ و سۆفی و خوێندکاری هەردوودیوی هەورامان، دیارە بەحوکمی تێکەڵاوی کاکەحەمە لەحوجرەی خوێندن لەگەڵ ئەمانەدا، شێوەزاری گۆرانی «هەورامی»بە باشی فێربووبوو وەقسەی بەڕەوانی پێدەکرد، زانینی ئەم شێوەزارە لەداهاتوودا بووە جۆگەلەیەکی خوڕو ڕژایە سەر ڕوباری مەرجەعیاتی نووسینی کاکەحەمەوەو لەم ڕێگایەشەوە توانی سوودی گەورە وەرگرێت بۆ لێکدانەوەو تاوتوێ کردنی دیوانی مەولەوی و شیرین و خوسرەوی خانای قوبادی و ئەوبابەتانەی کە بەو شێوەزارە نووسراونەتەوە. یەکێك لەو جۆگەلە خوڕانەی کە ڕژاونەتە سەر تواناو لێهاتوویی کاکەحەمە، زانیاریەکانی مامۆستا عبدولکەریمی مودەریسی باوکێتی کە لەوەوە گەلێ بەهرەی زانستی وەرگرتووەو

هەمیشە وەڵامی پرسیارەکانی داوەتەوەو کێشە مەعریفی و زانستیەکانی بۆ چارەسەرکردووەو ئەوەندەی پێی کرابێت نەیهێشتووە لەهیچ بوارێکدا پەکی بکەوێت و هەمیشە وەك دەریایەك لێی هەڵێنجاوەو بەکامی دڵ لێی بەهرەمەندبووە، با ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە مامۆستا عبدولکەریمی مودەریس خاوەنی کتێبخانەیەکی تایبەتی گەورەبووەو لەزۆر شوێنی ئەم کوردستانەوە کتێب و کەشکۆڵی دەگمەن و دەسنووسی بەنرخی بەدیاری بۆ هاتووەو کاکە حەمەش سوودی فرەی لێبینیوەو بۆتە سەرچاوەیەکی بە بایەخ بۆ نووسینەکانی، نابێت ڕۆڵی کاك فاتیحی برایمان لەبەرچاو نەبێت، کە ئەویش کاریگەری خۆی هەبووە لەسەر کاکە حەمە، بەتایبەت لەشرۆڤەو بەدواداچوون و لێکدانەوەکانی مەڕ دیوانی نالی، گەلێك جاران لەسەروبەندی لێکدانەوەکانی دیوانی نالیدا سەردانی کاك فاتیحم کردووە لەبەغداو سەرنجی ماندووبوونی کاك فاتیحم داوە بەدەست دیوانی نالییەوە، حەزدەکەم خوێنەر ئەوەش بزانێت کە مامۆستا فاتیح ڕووناکبیرێکی پایە بڵندو زانایەکی مەڕ بواری شیعری کلاسیکی کوردی بوو، دیارە ژیان بە تەنیشت ڕووناکبیری واوە خۆی لەخۆیدا گۆڕوتینێکە بۆ گۆڕینەوەی بیروڕا لەسەرجەم بوارە ئەدەبیی و ڕووناکبیرییەکاندا.

تەوەری سەرەکی لێهاتوویی و ڕووناکبیریی و توانا باڵایی هەموو ئەم هۆکارو سەرچاوانە خودی کاکە حەمەیە، لەوانەیە ئەم هەلانەی کە بۆ کاکە حەمە هەڵکەوتووە بۆزۆری تریش لوابێت و بەزیادیشەوە، بەڵام لەئەنجامدا هیچیان لێ دەرنەچووەو نەبوونەتە هیچ، کەواتە لایەنە زاتیەکەی کاکە حەمە، بەردی بناغەیەو هەر خودی خۆشیەتی کە توانیویەتی بە ماندووبوونی لە ڕادەبەدەر خۆی بگەیێنێتە ئەم ئاستە مەعریفیە باڵایە، واتە کارلێکی لایەنی زاتی کە خودی کاکە حەمەیە، لەگەڵ لایەنی بابەتی کە دەوروبەرو مەرجەعیاتەکانە، لە ڕەساترین شێوەدا چوارچێوەی گرتووە، با ئەوەش نەبوێرم کە توخمی زیرەکی و هەناسە درێژی و سەلیقەی نووسین و دڵسۆزی بۆ کارەکەو بەهەند وەرگرتنی ئەهەمیەتی نووسین و ڕووناکبیری لە جوڵاندن و بەرەوپێش بردنی کۆمەڵگەدا، ئەو سیفەت گەلەن کە پێکهاتەی ئۆرگانی کاکەحەمەن و ڕۆڵی گەورەیان بینیوە لە شێوەگرتنی کەسایەتییە ڕووناکبیریی و ئەدەبییەکەیدا.

عەبدولکەریم شێخانی

# کاکە حەمەی مەلا عەبدولکەریمی تێکۆشەر و ڕۆشنبیر

زیدەڕۆییم نەکردووەو ناشیکەم ئەگەر بڵێم کۆمەڵە سیفەتێك لە کاکە حەمەدا کۆبوونەتەوە، کەم وایە لە کەسێکی دیکەدا کۆببنەوە، جگە لەوەی کە لە قوتابخانەکەی باوکیدا سەرەتای زانستی ئایینیی هەڵێنجاوە، ئەو سەرچاوە ڕوونەی کە چەندان زانای ئایینیی لەو قوتابخانەیەدا پێگەیشتوون و بە مزگەوتەکانی کوردستاندا بلاوبوونەتەوە. ئەو، کە لە ساڵی ١٩٣١ لەگوندی بیارە لەدایکبووە، هەرلەوێش و پاشان لە مزگەوتی «حاجی حان» لە سلێمانی لەخزمەت باوکیدا خوێندوویەتی و لە ساڵی ١٩٥٤ خوێندنی تەواوکردووە.

کاك محەمەد هەر لە سەرەتای لاوییەوە حەزی لە ڕۆژنامە خوێندنەوە بووەو ڕۆژنامەوانیی پێ خۆش بووە. لەم ڕووەوە هەر لەبیارە گۆڤارێکی مانگانەی سیاسیی- ئایینیی بەناوی «العروە الوثقي» دەرکردووە کە بۆ ماوەی ساڵێك بەردەوام بووەو، کە هاتووشنەتە سلێمانی، نووسینی لە هەندێ ڕۆژنامەی عەرەبی لە بەغدا بلاوکردۆتەوە، جگە لەوەی کە وتاری لە ڕۆژنامەی ژینیشدا بلاوکردۆتەوە کە ئەوسا مامۆستا گۆران بەڕێوەی دەبرد.

کاکە حەمە، هەر زوو ئاشنایەتیی لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراقدا پەیداکردووەو لێی نزیك بووەتەوە، بۆیە لە ساڵی «١٩٤٧»ەوە دۆستایەتی لەگەڵ ڕۆژنامەی «ئازادی»و «القاعدە»ی نهێنی و «الاساس»و «الوطن»ی «حیزبی شعب» هەبووە. هەرلەو ساڵانەشەوە کاکە محەمەد هەوڵی داوە ئاشنایەتیی لەگەڵ ڕەوت و بەرهەمە پێشکەوتووەکانی «جەمال الدینی ئەفغانی»و «شێخ محەمەد عەبدە» و «شێخ محەمەد ڕەشید ڕەزا» پەیدابکات و شتێك لەبارەیانەوە بزانێت.

کاکە حەمە لەساڵی «١٩٥٢»ەوە پەیوەندی بە ڕێکخراوەکانی حیزبی شیوعیی عێراقەوە لە سلێمانی کردووەو هەر لەو ساڵەشەوە بووەتە ئەندامێکی چالاکی لیژنەی ئاشتیخوازانی سلێمانی و تا قەدەغەکردنی چالاکانە کاری تێدا کردووە.

قۆناغی گرنگ و پڕ بایەخ لەژیانی کاکە حەمەدا زۆرن، بەلام بەڕای من دەرکردنی گۆڤاری دەستنووسی «دەنگی فەقێ» کە لەگەڵ هەندێك لە هاوڕێکانی، ئەوانەی پێکەوە یەکێتیی قوتابییانی ئایینیان پێکەوە نابوو، زۆر گرنگە، چونکە کاکە حەمەی تینووی خوێندنەوەو خۆ ڕۆشنبیرکردن، لەنێو ڕیزەکانی حیزبی شیوعیدا، حیزبی ڕۆشنبیری و ڕۆشنبیران، لە هەرەتی لاویدا حەزی بە فراوان کردنی ئاسۆی بیرکردنەوەو

هۆشیارکردنەوەی جەماوەر دەکردو دەیویست لەو بوارو دۆخە چەق بەستووەی ئەوسای هەندێك ئایینخواز دەرچێ و ئەو توێژە ڕاپەڕێنێ. بۆیە دەنگی فەقێ ئەو گۆمی بێ دەنگی و خۆمات کردنەی شڵەقاندو گەلێك کەسی هۆشیارکردەوە، چونکە گۆڤارەکە دەگەیشتە بەشێکی زۆری ئەوسای مزگەوتەکانی سلێمانی و بگرە دەرەوەی سلێمانیش و ئەگەر بڵێین ڕەنگە هەندێ کەسی کۆنە پەرست و مێشك ژەنگ گرتوو پێی تێك چوون و شڵەژان، بەلام دۆست و پشتیوانی زۆری بۆ پەیدابوو.. جگەلەوەش دەبێ بڵێین کە دەرکردنی ئەو گۆڤارە جۆرە بوێرییەك بوو کە لەدەست هەموو کەس نەدەهات. ئیدی لەوە بەدواوە قۆناغێکی دیکە لە ژیانی کاکە حەمەدا دەستپێدەکات کە ئەویش قۆناغی گیران و زیندانی کردنە. حیزبی شیوعی عێراق هەر زوو گوێی ئەندام و لایەنگرو هەوادارانی خۆی بەم وتەیە دەزرینگاندەوە: «بەندیخانە ویستگەی حەسانەوەیە لەگەشتی ژیاندا»، بۆ ئەوەی تێیان بگەیەنێ کە ڕێگای خەبات و تێکۆشان بە گوڵ و گوڵزار نەڕازاوەتەوەو مرۆڤی خەباتگێڕ تووشی گیران و زیندانی کردن دەبێت و ئازارو تالاو دەچێژێ. یەکەم جار لە ساڵی ١٩٥٤ دەسگیرکراو بە ساڵێك زیندانی حوکم دراو دەبوایە ئەو ساڵە لە بەندیخانە بباتە سەر، یان کەفیلێکی هەبێ.. ئەویش کەفیلەکەی پێشکەش کردووەو بەردراوە.

لە ساڵی ١٩٥٥ جارێکی دیکەش بە تۆمەتی شیوعییەت دەسگیر کراوەتەوەو بە دووساڵ زیندانی کردن و ساڵ و نیوێك چاودێریی پۆلیس حوکم دراوە، بەلام دوای ئەوە لە دادگای پێداچوونەوەدا حوکمەکەی گۆڕاوە بە ساڵێك و ساڵێکیش چاودێریی پۆلیس.. ماوەی زیندانییەکەی لە زیندانی بەعقووبەو ماوەی چاودێرییەکەشی لە «بەدرە» بەسەربردووە. لەبەندیخانەی بەعقووبە لەگەڵ هاوڕێ زیندانییەکانی، بەشداریی لە مانگرتنی نان نەخواردندا کردووە کە «٢٣»ڕۆژ زیاتر درێژەی هەبووە. هەرچەندە کاکە حەمە لەساڵی «١٩٥٢»ەوە پەیوەندی بە حیزبی شیوعی عێراقەوە کردووە، بەلام لەساڵی ١٩٥٥ کاتێك کە لەگرتووخانەی کەرکوك بووە، نامەی ئەندامێتیی وەرگرتووە. کاکە حەمە وەك خۆی دەڵێ کاتێك کە لە «بەدرە» بووە، لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێی دوورخراوەی، بەشداریی لە دەرکردنی گۆڤارێکی عەرەبیدا، بەناوی «کوردستان» کردووە. دوای تەواوکردنی چاودێرییەکەی

براوەتەوە بۆ سلێمانی، بەڵام بەریان نەداوەو دوای ئەوەی چەند مانگێك لەزیندان هێشتیانەوە، جارێکی دیکە بە ساڵێك حوکم، یان پێشکەش کردنی کەفیلێك حوکم دراوەو ئەویش یەکێك بووەتە کەفیلی و بەردراوە، بەڵام هەر ئەو ڕۆژەی لە بەندیخانە ڕزگاری بووە، لە سلێمانی دوورخراوەتەوەو چووەتە کەرکوك و لەوێ نیشتەجێ بووە. لەناوەڕاستی ساڵی «١٩٥٧»ەوە لە کتێبخانەی گشتی کاری کـردووە. لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز کەمێك حەسانەوەی بەخۆیەوە دیوەو دەرکردنی گۆڤاری «شەفەق»ی پێ سپێرراوە. لەو ماوەیەدا لە وەزارەتی چاککردنی کشتوکاڵیش دامەزراوەو دوو ژمارەی گۆڤاری «هیوا»شی دەرکردووە.. ئینجا گەڕاوەتەوە کەرکوك و لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی حیزب، بەرپرسایەتیی ڕۆژنامەی «ئازادی»ی لقی کوردستانی حیزبی شیوعی پێ سپێرراوەو وتاری بۆ نووسیوە. ساڵی ١٩٦٣ کە کودەتا شوومەکەی ٨ی شوبات ڕووی دا، کاکە حەمە ئەو ماوەیەی تا ڕووخانی ئەو ڕژێمە فاشییە، بەنهێنی و خۆشاردنەوە بەسەربردووە. بەڵام لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٤ دیسان دەسگیرکراوەتەوەو دوای چەند مانگ مانەوە لە گرتووخانەکاندا بە پێنج ساڵ حوکم و سێ ساڵ چاودێریی حوکم دراوە کە «٣» ساڵی لەو ماوەی حوکمە بەسەربردووە و پاشان بە هەوڵ و تەقەلای بەڕێز مام جەلال بە فەرمانێکی کۆماری ئازادکراوە.

کاکە حەمە پیاوێکی بە بڕشت و دەست بەخێربووە لە نووسینداو لە زۆربەی گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا وتاری جوان و بەپێزی هەمە جۆری نووسیوەو لەگەڵ خوالێخۆشبووی باوکی، دیوانی «مەحوی»ی ساغ کردووەتەوەو لەو ماوەیەدا کە لە کۆڕی زانیاریی کوردبووە، بێ وچان کاری بۆ خزمەتی نووسین و زمانی کوردیی کردووە. زۆرجار نووسینەکانی وەك بۆمبا لەپەنا گوێی ڕژێم و ڕژێمدۆستاندا تەقیوەتەوە. لە سەردەمی «عوسمان محەمەد فایەق»دا کە بەڕێوەبەری دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی کوردی بوو و خۆیشی کورد بوو، وشەی کوردستانی لەو دەزگایەدا قەدەغەکردبوو. کاکە حەمە وتارێکی لە ڕۆژنامەی بیری نوێدا نووسی بەناوی «وتمان خەتەنە، بەڵام لەبنەوە نا» کە کاریگەرییەکی زۆری هەبوو. لەکۆڕێکدا کە «تاریق عەزیز» ئامادەی دەبێ، کاکە حەمە هەڵدەسێ و قسەدەکات. تاریق عەزیز دەپرسێ «هذا منو؟» وادیارە وتارەکەی کاکە حەمەشیان بۆ کردووە بە عەرەبی، ئەوکەسەی لای «تاریق عەزیز»ەوە دانیشتبوو، وەڵامی دەداتەوە: «هذا أبو الختان». کاکە حەمە ژیانی خۆی لە تافی گەنجیدا تا ئێستا بۆ خزمەتی گەلەکەی تەرخان کردووە و لەوپێناوەشدا باجی خۆی بە زیادەوە داوە.

ئێستاش کە دووساڵ و نۆ مانگە کەوتووی ناو جێگایە، ئەوەندەی نەخۆشیی دەرفەتی بدا، خەریکی پێداچوونەوەی شەرحی دیوانی سالمە کە باوکی و کاکە فاتیحی شەرحیان کردووەو بە هیوایە لەساڵی ٢٠١٢دا بلاوببێتەوەو بکەوێتە بەردەستی خوێنەران. هیوای لەشساغی و تەمەن درێژی بۆ کاکە حەمە دەخوازم، کە سەرەڕای نالەباریی باری تەندروستیی، قەڵەمەکەی هەر بە بڕشت و هەر لەکارە.

کاکە حەمەی مەلا کەریم(١٩٣١/٨/١٤) ئەو نووسەرەیە کە تا ڕادەیەکی باش لەکوردستان و عێراقدا ناسراوە. ئەمەش لە چەند بواری سەرنجێکەوەیە کە ناوبراو تێکۆشەرێکی کۆڵنەدەرو خاوەن هەڵوێست و ڕۆشنبیرێکی پێشکەوتنخوازو نووسەرو ڕۆژنامەنووسێکی بەتواناو ئەدیب و توێژەرێکی زانستپەروەرو وەرگێڕێکی داهێنەرە.

ئەگەر وەك تێکۆشەرێکی کۆڵنەدەر سەرنج بدرێ، دەبینین هەر لەسەرەتای لاوییەوە بیروباوەڕو ڕێبازی چینی کرێکارو جوتیارانی گرتۆتەبەرو هەرزوو بۆتە دۆست و پاشان(١٩٥٢) ئەندامی حیزبی شیوعی عێراق.

لەم حیزبەدا بەتێگەیشتنێکی ڕاستبینانە سەرنجی هەڵوێست و بۆچوونی مارکسیزمی داوە لە ئاست کێشەی نەتەوایەتیی نەتەوە ژێردەستەکان و هەر لەم گۆشەنیگایەشەوە چالاکانە لە خەباتی ڕزگاریخوازیی گەلی کوردستانیداو لە کۆششدا بۆ بەرەوپێشبردنی کولتوورو کەلەپوورو ئەدەب و ڕۆشنبیریی نەتەوەکەی بەشداریی کردووە.

قەڵەمە بە بڕشتەکەی چەکێکی تیژو برای بووە بۆ بەرگری لە خواست و ئاوات و مافە ڕەواکانی گەلە چەوساوەکەی و بۆ ڕیسواکردنی دوژمنانی کوردستانەکەی.

لەم تێکۆشانەدا نەسەختیی ژیان، نەداپڵۆسین و هەڕەشەو ترس وگرتن و ڕاونـان وبەندیخانەکانی باقوبەو نوگرە سەلمان و ڕومادی و حللەو ئەوانیتر، چۆکیان پێدانەداوەو ڕەشبینیان نەکردووەو هەرگەشبین بووە تا ڕژێمە کۆنەپەرست و دیکتاتۆرە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق لەناوچوون و ئەم لەسەر بیرو ڕێبازەکەی دڵسۆزماوەتەوەو هەمیشە خاوەن هەڵوێست بووە.

کاکە حەمە ئەندامێکی چالاکی ڕێکخراوی ئاشتیخوازانی سلێمانی بووە(١٩٥٢- ١٩٥٤).

ئەگەر وەك ڕۆشنبیرێکی پێشکەوتنخواز سەرنج بدرێ دەبینین بە خوێندنەوەو خۆفێرکردن بیرو هزری خۆی گەشەپێداوەو لەسەر خوێندنەوەی شاکارە ناوخۆیی و جیهانییەکان لە زانست و ئەدەبدا بەرهەمداربووەو، ئەگەرچی لەخوێندنی زانستە ئاینییەکاندا قۆناغێکی باشی بڕیوە، بەڵام لە ئەوهام و بیری کۆنەپەرستی بەدووربووەو، کتێبخانە ئاوەدانەکەشی و بەرهەمە بەپێزەکانیشی بەڵگەی هەڵهێنجانی ڕۆشنبیرییەکی پێشکەوتنخوازن.

ئەگەر وەك نووسەرێك سەرنج بدرێ دەبینین هەر لەسەرەتاوە بەرەبەرە

هەنگاوی ناوە (لە ساڵی ١٩٤٩دا بەعەرەبی ولەساڵی ١٩٥٢دا بە کـوردی) دەستی بە نووسین کـردووە، تا بۆتە گەورە نووسەرێکی کوردو بەزمانەکانی کوردی و عەرەبی چەندان بەرهەمی نووسین و وەرگێڕان و بەسەدان وتارو

توێژینەوە، بەشدارییەکی کاریگەری لە دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردیدا کردووە. جارجارەش هەست و سۆزی خۆی لە چەند پارچە شیعرێکی جواندا دەربڕیوە، ئەگەرچی خۆیشی بە شاعیر نازانێت..

کاکە حەمەی مەلا کەریم ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی نووسەرانی کوردبووەو لە یەکەم کۆنگرەی یەکێتیدا (١٩٧٠/٢/١٠) بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر هەڵبژێردراوە. ئـەوەنـدەی بۆی کرابێ لە ڕیزەکانی ئەم یەکێتییەداو لە دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەیدا(نووسەری کورد) ڕۆڵێکی کاریگەری بووە. کاکە حەمە هەردەم لە دژی ئەوەبووە دام و دەزگای بەعسیەکان دەسەڵات بەسەر یەکێتیی نووسەرانی کورددا بگرن و بیکەنە قەوارەیەکی بەتاڵ.

لە ڕووی چالاکی و ئاستی ڕۆشنبیری و زانیاریی کاکە حەمەوە لە زمان و ئەدەبی کوردیداو لە توێژینەوە لە بواری ئەدەب وبەتایبەتی شیعری کلاسیکی کوردیدا، کۆڕی زانیاریی کورد بە ئەندامی یاریدەدەر هەڵیبژاردووە، بەتایبەتی دوای ئەوەی چەند ساڵێك لەو دەزگایەدا کاری کردووەو شارەزای چالاکی و کارکردنی بوون.

ئەگەر وەك ڕۆژنامەنووسێکی بەتوانا سەرنج بدرێ، دەبینین کاکە حەمە بەڕاستی لەو بوارەدا خاوەن ئەزموون و بەتوانابووەو، لەگەڵێك ڕۆژنامەو گۆڤاردا کاری کردووەو، جێ پەنجەی بە چەندان ڕۆ ژنامەوگۆڤارو بڵاوکراوەی کوردی و عەرەبییەوە دیارە، وەك ڕۆژنامەی ژین و ڕۆژنامەی ئازادی و إتحاد الشعب و طریق الشعب و گۆڤاری شەفەق و هیواو برایەتی و التآخی و بیری نوێ (الفکر الجدید) و ڕێگای کوردستان و نووسەری کوردو هاوکاری و بەیان و کوردستانی نوێ و الإتحاد ...تاد.

لەبواری زمانی کوردی و عەرەبیدا کاکە حەمە شارەزاییەکی باشی هەیەو، هەندێکیش فارسی دەزانێت، شایانی باسە زۆر جار کاکە حەمە، لەڕووی بەتەنگەوەهاتنی دەقی بێهەڵەوە، خۆی هەڵەبڕیی وتارو بەرهەمەکانی خۆی ئەنجامدەدا.

لێرەدا کە بە کورتی ڕۆڵ و تێکۆشانی سیاسیی و ڕۆشنبیریی کاکە حەمە باسدەکەین و بەرز هەڵیدەسەنگێنین، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە کاکە حەمە لە هەموو ڕوویەکەوە تەواوو بێ کەموکورتیەو شتێوای نەنووسیوە کە شایانی ڕەخنە لێگرتن بێ، نەخێر، بێگومان ئەویش وەك هەموو کەس مرۆڤەو، مرۆڤیش دەشێ کەم و زۆر هەڵەو ناتەواوی هەبێ. بەڵام ئەوەی پتر لەژیان و تێکۆشان و چالاکی و

ئاستیی ڕۆشنبیریی و ئەدەبیی و زمانەوانیی و ڕۆڵی ئەم نووسەرە پێشکەوتنخوازە ناسراوەدا ڕەنگیداوەتەوە، لایەنە ڕاست و جوان و گەشەکانێتی، بەرهەم و

داهێنانە بەپیتەکانێتی کە بێگومان ژمارەیەکی زۆر لە خوێنەرانی کـوردی و عەرەبی، بەتایبەتی لاوان سـوودی زۆریـان لە

بەرهەمەکانی و لە نموونەی پرشنگداری وەرگرتووە.
ئێمە کە کاکە حەمەی نووسەری ناسراو لەهەندێ لایەنی ژیان و تێکۆشان و بەرهەمە ئەدەبیی و ڕۆشنبیریەکانیەوە هەڵدەسەنگێنین، دەبێ ئەوەش لەبەرچاوبگرین کە ئەم مرۆڤە بەسۆزو دڵناسکە ڕۆڵەی پەروەردەکراوی ناو کام خانەوادەیە.
باوکی بەڕێزیان( مەلا عەبدولکەریمی مودەریس) نەك تەنیا گەورە زانایەکی ئاینیی ئەم کوردستان و عێراقە بوو، بەڵکو لەسەر ئاستی وڵاتانی ئیسلامییش بەزانایەکی گەورە دادەنرا، بەڵکوهەروا عەرەبیزان و فارسیزان وکوردیزانێکی چاکیش بوو، توێژەرەوەیەکی بیرتیژی ئەدەبی کلاسیکی کورد بوو، زۆر بە وردی لە شیعرەکانی مەولەوی ونالی و مەحوی وسالم و ئەوانیتر گەیشتبوو کە چمکێکی تۆژینەوەکانی لەم بوارەدا بوونە سەرچاوەیەکی داهێنەرانەی ئەوتۆ کە بەوهۆیەوە گەلەکەمان زیاتر شانازیی بە ئەدەبی کلاسیکیمانەوە بکات.
کاك فاتحی برای کاکە حەمەش ئەدیب و تێکۆشەرێکی دیارو پێشکەوتنخوازبوو، هەروا کاك سەلاحی براشیان مرۆڤێکی ڕۆشنبیرەو، خۆشکە عالیەش ئەدیبێکی زانایەو، لەسەر نووسینی چیرۆك وبابەتی ئەدەبی و ڕۆشنبیری بەردەوامە..
هۆکارێکی دیکەی سەرکەوتن و دەرفەتی کارکردنی بەرهەمداری کاکە حەمە بێگومان هەڵوێستی شیرین خانمی هاوسەریتی کە بە مانای وشە هاوکارو بە خزمەت و پشتیوانێتی و ڕۆڵی ژنە کوردێکی گونجاوو کارامە بەرجەستە دەکات.
کاکە حەمەی مەلا کەریم هەربەهۆی ڕۆڵی کاریگەریەوە لە خەبات و کۆڵنەداندا، لە دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیدا، لە خزمەت ڕۆژنامەگەری و ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردیداو لە زۆر لایەنی زمانەوانی و ئەوانیتردا، وەك چۆن لەلایەن دڵسۆزان و ڕاستیپەروەران ونوێنەرانی گەلەوە چەندان جار ڕێزی لێنراوەو شایانی زیاتریشە، لەلایەن چەند نووسەرێکی بەڕێزیشەوە ڕەخنە لە بەرهەمەکانی گیراوە کە بە ڕاشکاوی دەریانخستووە هاوبیرو بۆچوونی نین،
پێموایە ئەمەش کارێکی ئاساییە، بەڵام لە لایەن نەیاران و بیرتاریك و هەلپەرستانیشەوە پەلاماری نارەوای دراوەو هێرشی براوەتە سەرو درۆو بوختانی بۆ کراوەو بەردی ناڕاستیی تێگیراوە، کە ئەمەش جارێکیتر ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ کە «بەرد دەگیرێتە درەختی بەردارو درەختی زڕ بەردی وێ ناکەوێ!».
دەستپێشخەرییەکی باش و بەجێیە کە دەزگای ڕۆشنبیریی سەردەم ئەم ژمارە تایبەتیە لەسەر ئەم ڕۆڵە دڵسۆزەی گەل و نیشتیمان دەردەکات، وەك چۆن لەمەوبەریش لەسەر گەورە نووسەران و ڕۆشنبیران و هونەرمەندانی گەلەکەمان دەستپێشخەریی لەم چەشنەی کردووە کە شایانی ڕێزو پێزانینەو بێگومان دەکەوێتە خانەی خزمەت بە ئەدەب و ڕۆشنبیریی پێشکەوتنخوازی گەلەکەمانەوە. بۆیە هیوای سەرکەوتن بۆ ئەم دەزگایەو، هیوای تەمەندرێژی بۆ کاکە حەمەی هاوڕێی دێرینم دەخوازم.

# محەمەدی مەلا کەریم
# لە دیدی ئەوانی ترەوە

رۆڤار

محەمەدی مەلا کەریم

شەرکردن لەسەر جوانی

بێگومان لەپای ئەو خزمەتە بەرچاوەی بنەماڵەی مودەڕیس بەگشتی و (حەمەی مەلا کەریم) بەتایبەت بە ئەدەبی کلاسیکی کردوویانە و تێیدا لە هەوڵی ساغکردنەوە و دۆزینەوە و بەچاپ گەیاندنی دیوانی شاعیرانی کلاسیکماندا ماندوونەناسانە و دڵسۆزانە تەمەنی خۆیان خستە خزمەت ئەو پرۆژە جدییەوە، لەپای هەموو ئەم بەخششە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییە، بنەماڵەی ناوبراو و خودی (کاکە حەمەی مەلا کەریم) هەمیشە جێگەی تێڕوانین و قسەو باسی خەڵکانێکی زۆر و نێوەندی ئەدەبی و ڕۆژنامەگەری کوردی بوون و وەك وەفایەك و ڕێزێك بۆ ئەو خزمەتەی ئەوان، هەمیشە قسە و بۆچوونی جوانیان لەبارەوە کراوە.

لێرەدا بۆچوونی چەند کەسایەتییەکی دیار دەخەینە ڕوو کە لە کتێبی ( شەڕ کردن لەسەر جوانی) دا، سەبارەت بەمامۆستا (محەمەدی مەلا کەریم) کردوویانە.

دیارە ئەم کتێبە لەسەر ئەرکی هەفتەنامەی ( ڕێگای کوردستان) چاپ و بلاو کراوەتەوە و لە پێشەکییەکی کورتدا ڕۆژنامەی (ڕێگای کوردستان) ئاماژەیان بەوە داوە کە ڕۆژنامەکەیان و گۆڤاری (بیری نوێ) لە قۆناغی ئەمڕۆشیاندا وەك دوو زایەڵەی ڕووناکبیری و کوانوی تازەگەری و ڕۆژنامەگەری، بەردەوام خۆیان بە قەرزاری قەڵەمێکی پڕشنگدار و پڕ بەرهەمی وەك ( حەمەی مەلا کەریم) دەزانن.

هەر لەو کتێبەدا نووسەر و سیاسەتمەدار ( کەمال شاکر) محەمەدی مەلاکەریم وەك نووسەرێکی گەورە و ڕۆشنبیرێکی کارا و چالاکی نێو ڕۆژنامەگەری کوردی دەناسێنێت، کە لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابـردووەوە توانیویەتی لە ڕێگای نووسین و مەعریفە و توێژینەوە و هزری پاراوی خۆیەوە، داهێنانی گەورە بکات و چەندین درز و کەلەبەر و بۆشایی لە قوتابخانەی زانین و هۆشیاری و تازەگەریدا پڕ بکاتەوە و لەم ڕێگایەشدا توانیویەتی نەوەیەك بخاتە ژێر کاریگەری توانا ڕۆشنبیرییەکانی خۆیەوە.

نووسەر و ڕۆشنبیر ( زیرەك کەمال) یش، لە بارەی کاك حەمەی مەلا کەریمەوە دەڵێت: لە وڵاتی ئێمەدا زۆرجار کاتێك خوێنەری تێکستێکی ئەدەبی یاخود بابەتێکی فیکری یان توێژینەوەیەکی فەلسەفی دەخوێنێتەوە، ئەگەر ئەو بابەت و شاکارە بیشخاتە نێو حاڵەتی بیرکردنەوە و ڕامانێکی قووڵ و سەرسامییەکی زۆرەوە، یەکسەر دەیەوێت بزانێت نووسەری بابەتەکە و ئاکار و هەڵسوکەوتوو جۆری بیرکردنەوەی چۆنە، چونکە لەناو خوێنەرانی وڵاتی ئێمەدا هەر بەتەنها تێکست و بابەت گرنگ نییە بەڵکو نووسەریش ئێجگار گرنگە، حەمەی مەلا کەریم یەکێکە لەو نووسەرانەی کە توانیویەتی کە لە هەردوو ئاست و بواردا هاوسەنگی بنووسێت، واتا ئەو وەك چۆن توانیویەتی لەنێو پانتایی نووسین و کایە ڕۆشنبیرییەکاندا داهێنانی گەورە و شاکاری مەزن و پڕ مانا بەرهەم بهێنێت، چۆن توانیویەتی لە نێو مەوداکانی نووسین و مەعریفە و توێژینەوە و ڕەخنەی زانستیدا ئامادەیی خۆی بچەسپێنێت، ئاواش لە ژیانی ڕۆژانەیدا لە مامەڵەکردنی لەگەڵ لایەنی بەرامبەردا و ئاکار و هەڵسوکەوت و جۆری بیرکردنەوەیشی هاوشانی نووسین و بەرهەمە مەعریفییەکانی بووە.

هەر لە کتێبی ( شەڕ کردن لە سەر جوانی) دا ( دڵزار) یش، پێیوایە حەمەی مەلا کەریم ڕووناکبیر و نووسەرێکی بیر تیژ و وردبین و پشوو درێژە و ئاسۆی تێکۆشانی هەمیشە لەبەرز بوونەوە و فراوانبووندایە، ناوبراو یادەوەرییەکی خۆی لەگەڵ حەمەی مەلاکەریم دەگێڕێتەوەو دەنووسێت: لە ١٥ ی ئاب تاکو ١٧ ی ئابی ١٩٦٠ کۆنگرەی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوە بەسترا، من و مامۆستا گۆران و کاکە حەمەی مەلا کەریم بانگێشتکرابووین و لەناو کۆنگرەدا بەیەك گەیشتینەوە، ڕۆژی دووای کۆنگرە ( مامۆستا گۆران و کاکە حەمە و عوسمان عەونی شاعیر و یەحیا عەبدول حەکیم و من) ڕێکەوتین گەشتێك بەناو هاوینە هەوارەکانی ڕێگای هاملتۆندا بکەین، ئەوە بوو لە شەقلاوە دەرچووین بەرەو گەلی عەلی بەگ و بێخاڵ و حاجی ئۆمەران و لە چایخانەکانی ئەو شوێنانە لاماندا و پشوومان وەرگرت و هەندێك وێنەی یادگاریمان گرت.

نووسەری کۆچکردوو ( مەحمود زامـدار) لەبارەی ئەو ڕێزلێنانەی ڕێگای کوردستان بۆ محەمەدی مەلا کەریم گرتیان، نووسیویەتی: ڕێزگرتن لە کەڵە پیاوێکی نیشتمان پەروەر و نووسەرێکی ماندووی وەك کاك محەمەدی مەلا کەریم، ڕێزلێنانە لەسەرلەبەری نووسەر و خامە هەڵگر و ڕۆشنبیرانی کوردستان، ڕێز لێنان و قەدر زانین لە بنەماڵەی پڕ لە بەخششی گەورەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ڕێزلێنانە لە نەوەی ژانگرتووی وەچەی نوێ و دەشڵێت: تۆ ئەوە بێنە پێش چاوی خۆت، گەر ئەو بنەماڵەیە و خودی کاکە حەمە و فاتیحی کاکی نەبوونایە، چ درزێك دەکەوتە نێو بناغەی پەوی ئەدەبیاتی کلاسیکیمان؟ ئەگەر خودی کاکە حەمەش نەبوایە چ کەلێنێك دەکەوتە نێو بزافی چەپ و پێشکەوتنخوازی کوردەوە؟.

لەڕووانگەی نووسەر و وەرگێڕیش ( غەریب پشدەری)

حەمەی مەلا کەریم، یەکێکە لەو نووسەر و قەڵەم بەدەست و پیاوە بوێر و ئازایانەی کە لە زۆرێك لە قۆناغەکانی ژیانی خۆیدا، بە هەڵەت و پەڵەت و هەوراز و نشێوانەی ژیاندا هاتووە و چووە، زۆر سەردەمی خۆشی و ناخۆشی و تاڵیی ژیانی چەشتووە، غەریب پشدەری دەشنووسێت: ڕۆژێك لە ڕۆژان وەکو ڕێبوارێکی ماندوو نەناس، ئەو پیاوە، ئەو مرۆڤە خۆڕاگرە، نە ئەژنۆی شلبوو، نە وەڕز بوو، نە هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکی سەر ڕێگا توانی کۆڵی پێبدات و وازی لە کارەکانی پێبێنێ، زۆر جار دەکەوتە بەر شەپۆلی لافاوی ئەو هێرشە گەورە و مەترسیدارانەی کە کەم کەس هەبوو لەو قۆناغە دژوارانەدا بتوانێ خۆیان لەبەردەمدا ڕابگرێ، بەڵام ئەو وەکو پایەیەکی داکوتراوی زۆر قایم بە بیروباوەڕێکی سەرکەوتووانە توانی بەسەر تەنگ و چەڵەمەکانی ژیاندا زاڵ بێت.

کەریم دەشتی شاعیر لە وتەیەکیدا دەڵێت: حەمەی مەلا کەریم یەکێکە لەو نووسەر و خەباتگێڕانەی کە نمونەیەکی زیندووی ئەوانەیانن لە ناو گەلی کورددا هەڵکەوتوون، جگە لەوەش یەکێکە لەو بنەماڵە ناودارەی کە هەمیشە لە خزمەتی ئەدەبی کوردیدا بووە، دەکرێت بڵێم ئەو خزمەتەی ئەوان لە بواری کۆکردنەوەی بەرهەمە کلاسیکیەکانی کوردی و توێژینەوەکانیان لەو بەرهەمانەدا کردوویانە، تاکو ئێستا هیچ دامو دەزگایەك نەیتوانیوە بەو توانا و ڕێکوپێکییە کار لەسەر کلاسیکی بکات، بەڕاستی ئێمە پێویستمان بە چەندین دامو دەزگا هەیە کە وەك ئەوان کار بکەن، دوواتر ئەوان لە نێو بنەماڵەی خۆیان توانیان بە تەنها و بە چەند کەسێك ئەم کارە گەورانە ئەنجام بدەن.

ئیسماعیل بەرزنجی شاعیر و ڕۆژنامەوان پێناسەیەکی (حەسەن قزڵجی) لەسەر بنەماڵەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس دێنێتەوە کە وتوویەتی: بنەماڵەی تێکستۆلۆکی کورد.

ئیسماعیل بەرزنجی دەشنووسێت: ڕۆڵی بنەماڵەی مەلا کەریمی مودەڕیسی ڕەحمەتی و کاکە فاتیحی ڕەحمەتی و کاکە حەمەش کە هیوادارم تەمەنی درێژ بێت، ڕۆڵێکی بەرچاو و مێژوویيان لە ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا گێڕاوە و بە ئاسانی پێناسە ناکرێ، من هەر کە چاوم کردەوە و هاتمە ناو جیهانی ئەدەبەوە، کاکە حەمەم وەك شۆڕەسوارێکی دەست ڕەنگین لە بواری ساغکردنەوەی دەقی شیعری کلاسیکی و ڕۆژنامەوانی و زمانەوانی و زۆر بواری دیدا جێپەنجەی دیارە، یەکێك بووە لەو نووسەرە کوردانەی توانیویەتی لە هەموو سەردەمە دژوارەکاندا، خاوەن هەڵوێستێکی خۆڕاگرانە و بوێرانە بێت.

لایەنێکی دیکەی خزمەتگوزاری کاکە حەمە بە بواری ڕۆشنبیری، لایەنی ڕۆژنامەوانییە، ئەو یەکێك بووە لە نووسەرە هەرە دیارەکانی ڕۆژنامە پێشکەوتنخوازەکان، ئەوانەی کە حزبی شیوعی دەریدەکرن، کاکە حەمە هەمیشە خاوەنی هەڵوێستی خۆی بووە و هەردەم بە هەڵوێستی بوێرانە بەرگری لە کولتووری ڕەسەنی کوردی و یەکێتی نووسەرانی کورد کـردووە، تەنانەت بەرگری لە خـودی نووسەری کورد کردووە بەرامبەر ئەو هەڕەشەو گوڕەشانەی ڕژێم دەیکردە سەر نووسەرانی کورد.

سەلاح عومەر وەك چیرۆکنووسێك دەنووسێت: ئەدیبی نیشتمانپەروەر هەمیشە گەورەیە و لە ناخی میللەتەکەیدا دەژی، لە ناو ویژدانی ڕۆڵەکانی بە نەمری دەمێنێتەوە، بۆیە ڕێزگرتن لەم نیشتمان پەروەرانە بەتایبەت کاکە حەمە، پێویستە شایانی سوپاس بێت، دیارە ئەم نووسەرە چەندی بۆ بکرێت و چەندی لەسەر بنووسرێت هێشتا کەمە و ناتوانین حەقی تەواوی بدەینێ، بەڵام هەمیشە کاك محەمەدی مەلا کەریم لەلای من ڕێزێکی تایبەتی هەیە، ئەو کاتانەی تازە دەستم دابوویە نووسین بە پەرۆشەوە بەرهەمەکانیم دەخوێندەوە، وەك هەموو ئەو نووسەر و خوێنەرانەی چاوەڕێی بەرهەمی بە پێز بوون چاوەڕێم دەکرد بەرهەمی تازەی بخوێنمەوە، چونکە ئەو نووسەرێکی خاوەن فیکر و فەلسەفەی هەمە لایەن بوو، دەیویست لەڕێگەی نووسینەکانیەوە ئەو فیکر و فەلسەفەی باوەڕی پێی هەیە بیگەیەنێ.

سەلام عومەریش نووسیویەتی: ئەوکاتەی کولتوور و ئەدەبی کوردی پێویستییان بە نوێکردنەوە و توێژینەوە هەبوو، لەو سەردەمانەی شیعری کلاسیکی کوردی بە قۆناغە دژوارەکاندا ڕەتدەبوو، سەردەمێك کە شیعر و شاکارەکانمان پەرتەوازە بوون و لە چاوەڕوانی کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەدا بوون، ئالەو ساتە هەستیارانەدا بنەماڵەی محەمەدی مەلا کەریم هەستان بە ئەنجامدانی ئەم پڕۆژانە و ئەدەبیاتی کوردییان لە نەمان و پەرتەوازە بوون قوتار کرد.

ئەو کار و پڕۆژانەی ئەوان لە نیو سەدەی ڕابردوو زیاتریش ئەنجامیان داوە جێگای بایەخن و گەورەترین ئەرکیان لەکۆڵ زمانزان و ڕۆشنبیر و نووسەرانی کورد کردووەتەوە، ئاخر حەمەی مەلا کەریم لەناو بنەماڵەیەکدا گۆشکراوە و لەنێو دنیایەکدا گەورە بووە، کە جگە لە وشە و بەرخودان، چیتر فێر نەبوون، بۆیە هەڵوێستی ئەم کەڵە نووسەرە لەوە زیاتر هەڵدەگرێت کە بە چەند وشەیەك پێناسە بکرێت.

لە پێش هەموو شتێکدا ئەمەوێ بڵێم، زۆر سوپاستان ئەکەم کە باسی ئەم جارەتان لە «ڕۆڤار»دا لەسەر «حەمە»یە.
دیاردەیەکی جوانە ئینسان لە ژیانی خۆیدا ڕێزلێنان و یادکردنەوەی بۆ بکرێتەوە و بەسەر بکرێتەوە،
نەك دوای مردنی، بۆ ئەوەی ببێتە هاندەرێك بۆی بۆ بەرهەم و خزمەتی زیاتر.
ئەمەوێ ئەوەشتان پێ بڵێم من نە نووسەرم نە دەستی نووسینم هەیە.
بەڵام ئەمانە چەند یادەوەرییەکن لەگەڵ حەمەدا بەشێوەیەکی ساکارانە بۆتان باس ئەکەم، من وەك حەمەم ناسیوە، هەمیشە خۆی بە قەرزاری ئەو میللەتە زانیوە، هەرچی کردووە لە ژیانیا لە بواری سیاسەت و خۆشەویستیی نەتەوەو نیشتمان و ئەدەبدا لە قەناعەتی خۆیەوە ئەیکاو لە ناخی خۆیەوە هەڵقوڵاوە
بەڵکو زۆرجار لێم بیستووە ئاواتی خواستووە بیتوانیایە خزمەتی زیاتر بکات، هەتاکو بڵێ ی دڵسۆزو خۆبەخشە بۆ بیروباوەڕەکەی، بۆ گەل و نیشتمانەکەی، بۆ هەموو ئینسانیەت، حەزئەکات هەموو کەس لە خۆشیدا بژی و چەوسانەوە نەمێنێت.
هەتا بڵێ ی ئینسانێکی سادەو ساکارە، ڕق و کینە هەر نازانێ، تەنانەت لەگەڵ ئەوانەش کە قسەی پێ ئەڵێن، یاخود لە دژی ئەنووسن. دەم و دڵی وەك یەکە، لە دەرەوەو لە ماڵەوە یەك کردەوەو ڕەفتاری هەیە.
لەدنیادا هیچ تەماعی نیە، تەنیا لە کتێبدا نەبێ. کتێبەکانی زۆر خۆش ئەوێ. حەزئەکات لە هەموو کتێبێك دوانی هەبێت، یەکێکیان بۆ کتێبخانەکەی بە تازەیی هەڵیگرێ، ئەوی تریان بۆ خوێندنەوە. یاخود ئەگەر توێژەرێك، یاخود کەسێك، داوای لێ کرد وەکو سەرچاوە، یان بۆ خوێندنەوە بیداتێ.
لێرەدا ئەمەوێ چەند هەڵوێست و ڕووداوێکتان بۆ باس بکەم. هەڵوێست و ڕووداو زۆرن، بەڵام لێرەدا باسی هەندێکتان بۆ ئەکەم.
ئەوەی لە هەمووی خۆشترە کاتێك ژیانی هاوسەریمان پێکەوەناو گواستمیەوە، لەگەڵ خۆی جانتایەکی هێنابوو بۆ ئوتێلەکە، ئایا ئەو جانتایە چی تیابوو؟...
ئەوکاتە «حەمە» خەریکی دیوانی حاجی قادری کۆیی بوو، کتێبەکە «هەنگاوێکی تر بە ڕێگەی ساغ کردنەوەی شیعری حاجی قادری کۆییدا» لەگەڵ خۆی پرۆڤەی ئەو کتێبەی هێنابوو بۆ ئوتێلەکە بۆ هەڵەچنی لەگەڵ منا. کتێبەکەی دەرهێناو وتی ئەم کتێبەم هێناوە لەگەڵ خۆم. وتم: ئەم چەند ڕۆژە لە ئوتێلەکە لەگەڵ شیرین هەڵەچنی بکەین با کاتمان بە فیرۆ نەدەین.
دەستمان کرد بە هەڵەچنی کتێبەکەو پێ ی وتم: زۆرم پێ خۆشە تۆ کوردیەکەت باشە وەکو عەرەبیەکەت، ترسام کوردیەکەت باش نەبێ تۆ لە بەغدا ژیاوی.
لەو ڕۆژەوە تا ئێستا هەمیشە هەڵەچنی هەموو نووسینەکانی لەگەڵ ئەکەم بە کوردی و بە عەرەبی.
کاتێك لە بەغدا بووین، دراوسێکان حەمەیان زۆر خۆش ئەویست و زۆر بەڕێزەوە سەیریان ئەکرد.
ئەیان وت: تەنیا ئەم بوو هات بەڕووی جیش شەعبیەکانداو جوابی دانەوە کاتێك ویستیان ڕاپێچی کەن بۆ جیشی شەعبی، پێ ی ئەوتن من حەزناکەم بچم بۆ جیش شەعبی ئێوە بە زۆر ئەم خەڵکە ئەبەن.
ئەیان وت: بەدرێژایی ڕێگا لە زیلەکەدا قسەی کردووە بە دەنگی بەرز هەتا یەکێك لە جیش شەعبیەکان پێ ی وتووە تۆ چیت، وادیارە تۆ شتێکت لەژێر سەرایە. ئەمە بۆ ئەوکاتە زۆر گرنگ بوو. حەمە لەهەچ کۆڕو کۆبوونەوەیەکدا بەشداری بکردایە. وەك نیشتمان پەروەرێکی ئازاد بیرو سەربەرزو خاوەن هەڵوێست بەشداری ئەکرد.
جارێکی تر هەر زەمانی «سەدام» بوو، لەیادی ڕۆژنامەوانی کوردیدا، دەزگای ڕۆشنبیری کوردی داوایان لێ کردبوو وتارێك بنووسێ لەسەر مێژووی ڕۆژنامەی کوردی، بەو بۆنەیەوە حەمەش وتارێکی دوورودرێژی نووسی لەسەر ئەو باسە. کاتێك بەڕێوەبەری دەزگا وتارەکەی دی پێی وت: کاکە حەمە ئەم وتارە زۆر جوانە بەڵام ناوی «سید الرئیسی»ی تیا نیە واتە «سەدام» ئەبێ وتارەکەت بگۆڕی. حەمەش وەڵامی دایەوەو وتی من ئەوەی نوسیوومە ئەوە ئەخوێنمەوە. ئەگەر بە دڵتان نیە خواحافیز من ئەڕۆم. بەڕێوەبەری دەزگا هیچ چاری نەمابوو چونکە کەسانێکی زۆر لە هۆڵەکە دانیشتبوون، چاوەڕێ ی وتارەکەی حەمەیان ئەکرد، خوا هەڵناگرێ بەڕێوەبەری دەزگا بێ دەنگ بە حەمەی وت: من لەبەر خۆتمە ئەترسم تووشی کێشەیەك بیت.
حەمە وتی: هیچ گوێ ی مەدەرێ، چووە سەر سەکۆی هۆڵەکەو دەستی کرد بە خوێندنەوەی وتارەکەی. دانیشتوان هەموو گوێیان گرتبوو. کاتێك تەواوبوو دەستیان کرد بە چەپڵە ڕێزان.
بەڵام بەرپرسانی ڕژێم هیچ وتارەکەیان بە دڵ نەبوو. کەسێکیان بە جلی «سەوزی حزبیەوە» هەڵساو وتی: ئەم وتارە زۆر جوانە، بەڵام ناوی «سید الرئیس»ی تیا نیە «سید الرئیس» سەرۆکی عێراقەو خزمەتی زۆری ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی کردووە،

ئەبوایە ناوی ئەوی تیا بوایە. هێشتا ئەو لە قسەکانی تەواو نەبوبوو لەولاوە کەسێکی تر لە بەرپرسە حزبیەکان هەڵساو هەمان قسەی دووبارە کردەوە.

دانیشتوانی هۆڵەکە هەموو خەمیی حەمەیان بوو نەك توشی تەنگ و چەڵەمەیەك بێت لەبەر ئەو هۆیە.

حەمەش هەر زۆر بە شێنەیی وەڵامی دانەوەو وتی: وتاریی من لەسەر مێژووی ڕۆژنامەی کوردییە. هەموو کەس ئەزانێ «سەدام حسێن» ڕەئیس جمهوریی عێراقە، پێویست ناکات من لێرە باسی بکەم، یاخود ناوی بهێنم.

هەر خێرا لەولاوە براو هاوڕێ ی خۆشەویست «دکتۆر کەمال مەزهەر»هەڵساو وتی وتارەکەی کاکە حەمە «شێخ الصحفیین» واتە «پیرە پیاو ماقوڵی ڕۆژنامەگەری» ئەوەندە وتارەکەی جوانەو بەپێزەو بە عەرەبیەکی جوان نووسراوە. ئەگەر «سید الرئیس» خۆی لێرە بوایە لەم هۆڵە. ئەویش بە دەستی خۆی چەپڵەی بۆ لێ ئەدا.

وەك بڵێ ی «کاك کەمال» ئاوێکی ساردی کرد بە ئاگرا. بەرپرسەکان بێ دەنگ بوون، هەر لەو لاوە بەڕێز کاك «نەجمەدین نەقشبەندی» هەڵساو وتی کاکە حەمە ئەوەندە جوانەو بەنرخە شایانی ئەوەیە بۆ مناقەشەی ماجستەر، یاخود دکتۆرا بەکاربهێنرێ. و لە وڵاتان بڕوانامەی ماستەر، یاخود دکتۆرا ئەدەن لەسەر ئەم جۆرە توێژینەوانە.

بەم قسانە بەرپرسەکان بێ دەنگ بوون.

دانیشتوان واقیان وڕما بوو، ئەترسان حەمە تووشی شتێك بێت. ئەمە ئێستا ڕەنگە زۆر شتێکی ئاسایی بێت، بەڵام بۆ ئەوکاتە جۆرە تێکۆشانێك بوو، ئیتر من و حەمەش هەڵساین و گەڕاینەوە بۆماڵەوەو هۆڵەکەمان بەجێ هێشت، لە کاتێکدا

ڕەووف بێگەرد    حەمەی مەلا کەریم    شیرین فەرەج    محێدین زەنگەنە

ئەوان شیرینی و خواردنیان ئامادەکردبوو بەو بۆنەیەوە.
حەمە ئینسانێکی ورەبەرزو گەش بینە، لە «٢٠٠٩/٤/١٦»وە نەخۆشەو لەسەر جێگە کەوتووە، تاکو نزیکەی دووساڵ نەیئەتوانی لە جێگەی خۆی بجوڵێ و هەڵسێ. بەڵام هەر گەشبین بوو ئەیگوت: چاك ئەبمەوەو ئەچمەوە سەر مێزەکەم دەست ئەکەم بە نووسین.
ئێستا سوپاس بۆ خوا تۆزێك باشترە لە جاران، بەڵام ئێستا ئاواتی ئەوەیە بتوانێ بچێتە سەرەوەو سەیرێکی کتێبخانەکەی بکات جارێکی تر. ژیواری کوڕمان زۆر حەزی لە کتێبەو جار جار ئەگەر حەزی لە کتێبێك بوایە لە کتێبخانەکەی باوکی ئەیبرد بۆ ژوورەکەی خۆی.
هەموو جارێك «حەمە» ئەچووە ژوورەکەی ژیوارو چی کتێبی خۆی بوو لێ ی ئەسەندەوە، ئەمە پێش ئەوەی حەمە نەخۆش کەوێ، ئێستا هەموو جارێك بە ژیوار ئەڵێ هەر چاك ببمەوە ئەچمە ژوورەکەت چی کتێبی منت بردووە ئەیبەمەوە.
ژیواریش ئەڵێ بابە گیان من لەوەتی تۆ نەخۆشی، دڵم نایە کتێبت لێ بەرم. کاتێك بردمان بۆ «عەمان» بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی، لە نەخۆشخانە کەوتبوو تەنانەت شەو قسەی خۆشیی ئەکردو شیعری ئەخوێندەوە لەگەڵ دکتۆرو کارمەندەکان بە عەرەبی فەسیح. ئەوانیش زۆریان پێ خۆش بوو ئەیان گووت: جەواهیرییەکی تر هەیە لە عێراق. منیش پێم ئەوتن ئێمە کوردین، عەرەبی زمانی خۆی نییە ئاوا قسەی پێ ئەکات. ئەوانیش زۆر سەرسام بوون بە عەرەبییەکەی، دوای چەند ڕۆژێك باری تەندروستی زۆر خراپ بوو تاکو وایلێهات بیبەن بۆ بوژانەوەی دڵ، تا «٦-٧»ڕۆژ بێ هۆش بوو قسەی بۆ نەئەکرا، بەتەمای نەبووین چاك بێتەوە. لەگەڵ زمانی کرایەوەو قسەی کرد، هاواری کرد کتێبەکانم شیرین، کتێبەکانم، واتە لەو زروفەشا هەر خەمیی کتێبەکانی بوو نەك هی من و منداڵەکانی.
کاتێك لە بەغدا بووین هەمیشە ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێبە کوردستانیەکانمان بۆ ئەهات. کە زۆریان لای ڕژێم قاچاغ بوون. برادەرانی دیموکراتی ئێران کۆمەڵ و حیزبە ئێرانیەکان و کاك شێخ تایەری ڕەحمەتی بۆیان ئەهێنایین.
بەردەوام بەنهێنی کتێبی ئەپێچایەوەو تێکەڵی کتێبی ئاسایی ئەکردو ئەینارد بۆ دەرەوەی وڵات بۆ ئەو قوتابیانە کە لە هەندەران بوون، زۆرجار کتێبی دژی ڕژێمی ئەنارد، ئەیپێچایەوە لەگەڵ جەماعەتی پۆستە ڕێك کەوتبوو دیاری بۆ ئەبردن تاکو نەیکەنەوە.
ئەیوت ئەو کوردانەی دەرەوە سوودی لێ وەرئەگرن.

من و حەمە دوو هاوڕێ ی هاوبیرو هاوڕێگاین «٢٣» ساڵە پێکەوە ئەژین، پەیوەندیمان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەهێزتر ئەبێت.
من هەر لەمناڵییەوە زۆر حەزم لە کتێب و کتێب خوێندنەوە بوو.
یەکێك لە هۆیە سەرەکیەکانم بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ حەمە. کتێبەکانی و نووسینەکانی بوون. وام ئەزانی شەو و ڕۆژ خەریکی خوێندنەوە ئەبم.
بەڵام بەداخەوە زۆر کەم دەرفەتی خوێندنەوەم هەیە بەهۆی ئەرکی ماڵ و مناڵەوە.
ئێستا لەکاتی ئەم نەخۆشیەی حەمەدا، ئەبێ شت بۆ ئەویش بخوێنمەوە لەکاتی دەست بەتاڵی دا، چونکە ئەو چاوی باش نییە.
لەیەکەم ساڵەکانی ژیانماندا یارمەتی زۆری ئەدام، لە بەخێوکردنی مناڵەکان و کاروباری ناو ماڵدا. لەکاتێکا من کارمەندبووم و دەوامم هەبوو، بەڵام لەساڵی «١٩٩٥»وە ئیتر خۆم خانەنشینی کرد، بە پانزە ساڵ خزمەت و سێ مناڵ. هەموو ئەرکی ماڵومناڵم خستە ئەستۆی خۆم و بۆ ئەوەی ئەو خۆی تەرخان بکات بۆ کاروباری ئەدەبی. بەڵام بەداخەوە ئەو هەر بە ئیشی ئەم لاو ئەولادا خۆی خەریك ئەکرد، ئەڵێ گرنگ ئەوەیە کتێبخانەی کوردی دەوڵەمەند بێت.
چەند ساڵە کەشکۆڵەکەی «مەحمود پاشای جافی» لایە، تا ئێستا تەواوی نەکردووە.
دیوانی سالم لەولاوە هەر هاوار هاواریەتی، یادەوەری زۆری لایە بەردەوام پێی ئەڵێم بیان نوسە، بەتایبەتی لە بەندیخانە.
لێرەدا هەربۆ خۆشی باسی چەند ڕووداوێك ئەکەم بۆتان ساڵی «١٩٥٤»کاتێك خۆی شاردبۆوە لەماڵی ڕەحمەتی کاك «عوسمان حەمە نادر» کە دراوسێیان بوو. وە زۆر برادەری باوکی بوو. هەموو ڕۆژێك دایکی واتە «پورە ئامینە» ئەچوو بۆ ماڵی کاك عوسمان و لێی ئەپرسی بەڵکو سۆراخێکی حەمە بزانی ئەویش پێی ئەووت «حەمە» باشەو لە هۆرین و شێخانە. حەمەش لە ژوورەکەی سەرەوە خۆی شاردبۆوە خەریکی کتێب و خوێندنەوە بوو، گوێی لە دەنگی دایکی بوو، بەڵام قسەی نە ئەکرد.
یاخود لە تاراوگەی «بەدرە» لەگەڵ کۆمەڵێك دوورخراوەی سیاسی گۆڤارێکیان دەرکردووە بەناوی کوردستان، دوای ئەوە پۆلیس پێی زانی قەدەغەی کرد لێیان.
ئیتر با زیاتر درێژەی پێ نەدەم زۆر شتی تر هەیە بینووسم، لێرەدا هەر ئەوەندە بەسەو سوپاسی هەموو لایەك ئەکەم ئیتر خۆشیتان.

